زنجیرەی وت وویژی قوتابییان

- ٢ -



# تاکەی دوورە پەرێزبم؟

حبیب محمد سعید



١٤٠٣ك - ١٩٨٣ز

زنجیرەی وت وویژی قوتابیان

– ٢ –

# تاکەی دوورە پەرێزم؟

حبيب محمد سعيد

مطبعة الارشاد – بغداد

بسم الله الرحمن الرحيم

« الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على سيدنا محمد و على آله وصحبه و من دعا بدعوته المباركة الى يوم الدين » .

# پێشکەش

* بە قوتابی‌یە چاوکراوەکان ، کە بە جوانیی لە ڕێگای ڕاستی ئیسلام شارەزا بوون و ژیانیان تەرخان ئەکەن بۆ گەیاندنی بە مرۆڤایەتی •

* بەو قوتابیانەش کە ئامادەن گوێ بگرن لە دەنگی ڕاستی و خۆیان چاك و خراپ هەڵئەسەنگێنن ، تا ژیانیان بە فەرمانی بەرز و پیرۆزی ڕێگای سەرفرازیی بڕازێننەوە ••

## - ١ -

[ شەماڵ هەروا ، بە پشتیوانیی خوای گەورە لە سەر بانگی خۆی بەردەوام بوو،ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر خۆی و برا قوتابییەکانی لە ئیسلام شارەزا ئەکرد ٠٠ هەموو خەریك بوون بە زانیاریی ئیسلامی پیرۆز دڵ و مێشکیان پاراو ئەکرد ٠٠ وە بە ڕەفتاری ئیسلامی هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی خۆیان ئەڕازاندەوە، بە ڕایانە خەریکی بانگ کردن بوون بۆ لای خوا ٠٠ ڕێگایان بۆ هەردەمە سەر لێ شێواوەکان پاك ئەکردەوە ، تا لە ڕێبازی خوا شارەزا ببن ٠٠ لە سایەی قورئانا خۆشترین و بە ئارامترین ژیانیان ئەبردە سەر ٠٠ ئامۆژگاریە بە نرخەکانی و چیرۆکە پەروەردەییەکانی ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر سەرنجی ڕائەکێشان ٠٠ بۆیە بە ئاواتەوە بوون هاوەڵە قوتابییەکانیان لەم خێر و بێرە بێ بەش نەبن ٠٠ خوا خوایان بوو هەموو یەکێکیان بێتە سەر ڕاستە شەقام ، تا تامی برایەتی و خۆشەویستیی ڕاستەقینە بکات ٠٠ تا بزانێ

ئەو ژیانە ئاژەڵی یە کە نافامەکانی بە سەرموەیە بە هیچ شێوەیەك شیاوی مرۆڤی وریا و هۆشیار نی یە ٠

زانیاریی قورئـان ، وەك دەریایـەکی بێ پایانی ڕوون و دڵ ڕفێن ، دڵی ڕفاند بوون ٠٠ چەندە گەشت و گوزاریان لە ناودا بکردایە لێی تێر نەئەبوون ٠ لـە پـەڕاوێکی ڕەنگینەوە بۆ یـەکێکی تر ٠٠ لـە یاسایـەکی قورئـانیـی پەروەردەیی یەوە ، بۆ یەکێکی تر ٠٠ هەروا ئەم جۆرە گەشتانەدا بەردەوام ئەبوون ٠٠ لەگـەڵ ئەمـەشا ڕۆژ بـە ڕۆژ لە ژیـانی قوتابخـانەدا سەرکەوتوو تر ئـەبوون چونکـە ئـەوەی لـە قوتابخانە پێیان ئـەوترا ئەوان زیاتر شارەزا بوون، جا هەرچی گونجاو بوایە وەریان ئەگرت. وە هەرچیش لار و وێر بوایە لە نێوان خۆیاندا وت و وێژیان لە سەر ئەکرد ٠٠ وە بە ڕەفتاری شیرین قوتابخانەیان ڕازاندبۆوە ٠

لەو لاوە قوتابی یە بێ باوەڕەکانی تر لـەم ژیانە خۆشـە بێ ئاگا بوون ، ئەمانیـان بـە دواکەوتوو ئەدایـە قەڵـەم !٠ سەرکەوتنەکانی تاقی کردنـەوەکانیشیان بوو بووە دەرزی یەکی تیژ و ئەچەقی بە هەناوی ڕەش هەڵگەڕاویاندا ،

گێلانە زۆر شانازی‌یان ئەکرد بـە ژیانە تاڵ و ئاڵۆزەکەیانەوە ٠٠ وایان ئـەزانی مرۆڤ لـەو جۆرە ژیانە بەو لاوە هیچی تری بۆ ناڵوێت ٠٠ هەمیشە خەریکی جـەنگ و ئاژاوە و تەشەر و رەخنـەی بێ سـوود و پاشـملە باسـکردنـی یـەکتری بوون ، لـەبـەر بێشـەرمـی و بێ ئابروویان خـەڵکی لێیان بێزار بوو بوو ٠٠ تەمەڵی و دواکەوتن و بە جێمانیان لە قوتابخانە شتێکی روون و ئاشـکرا بوو ٠٠ خۆ ناشیرین کردنیان بە لای مامۆستا و قوتابی‌یەوە ئاسایی بوو ٠٠ تەنها خەمیان ئەوە بوو بچن بـە لای دەستگیرەکانیانەوە گومان و دڕو دڵی بێنن و بیـدەن بـە گـوێـی موسـوڵمـانـە تـازە پێگەیشتووەکانا تا لـە ئیسـلام پەشیمانیـان بکەنـەوە ٠٠ تا بیـان ترسێنن ٠٠ تا دڵیـان ساردکەنەوە ٠٠ کەوا ئیسلام بە کەڵک نایە ! ٠٠ ئیسـلام سـەر نـاکـەوێـت !٠٠٠ موسوڵمانەکان کـەمن !٠٠ رۆژ بـە رۆژ بێ ئایینی و بێ رەوشتی پەرە ئـەسێنی !٠٠ جا ئەمانەیان ئـەدا بـە گوێی قوتابیانی تردا تا باوەڕ بـە بانگی راستی‌ی نەکـەن و شـوێنی نەکەون ٠٠ بە نیازی گلاویان ئەیان ویست بە دەم رۆشنایی خوا بەربەست بکەن ٠٠ نەهێڵن

ئایینی خوا بلاوبێتەوە ٠٠نەهێلن موسولمانەکان
لە ئایینەکەیان شارەزا بن ٠٠ بـەلام چونکـە
شەمال و براکانی بۆ خوا لێ برا بوون ،چونکە
بە پێی نەخشە شیرینەکانی ئیسلام بە نەرم و
نیانی ێ لە سەر خۆوە ئیشیان ئەکرد ، رۆژ بە
رۆژ سەرکەوتنی خوایان بۆ ئەهات ، قوتابی‌یان
چاویان ئەکردەوە و لە راستی‌ی ئەگەیشتن ٠٠
لە پێشەوە بێ ئاگا بوون لە ئیسلام . پەروەردە
و رەفتـاری موسولمانـەکان سـەرسـامی کرد
بوون ٠٠ ئـەمانـە چۆن هـەلکـەوتون ؟ ئـەو
رێبـازەی ئەمانـەی پێگـەیاندووە دیـارە بێ
لەکەیە ٠٠ بۆیـە بـە پەرۆشەوە لێیـان نزیك
ئەکەوتنەوە تا شارەزای ئیسلامی بێگەرد ببن
٠٠ یەکێ لەوانـە قوتابیەکی ئێسك سووك و
پـاك و خـاوێـن سـروشـت بوو بـە نـاوی
« هۆشمەند » دوای ماوەیەك لە خۆ گرتن ،ناچار
بوو بـە گوێی دلـە هۆشیارەکەی بکات و لـە
شەمال نزیك ببێتەوە ٠ ]

**هۆشمەند :** کاکە شەماڵ ‥ چۆنی ؟

**شەماڵ :** سوپاست ئەکەم کاکە هۆشمەند گیان ، تۆ چۆنی ؟

**هۆشمەند :** سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی وا هیدایەت داوە ‥

**شەماڵ :** هەمیشە سوپاس بۆ خوای گەورەو مەزن ‥ داواکارم لە خوای گەورە و میهرەبان هەموو لایەکمان لە ژێر سێبەری باڵی رەحمەتیا جێ بکاتەوە و لە رێگای راست لامان نەدا ‥

**هۆشمەند :** منیش داوا کارم لە خوا دڵ و دەروونم لە سەر ئەم بیر و هۆشەی تۆ راگیر کا ‥

**شەماڵ :** کاکە هۆشمەند گیان ، هەر کاتێ موسوڵمان زۆر بکاتە پەروەردگار و خۆشەویستی خۆی ،‥ ئەوا دەرگای رەحمەتی خوا لە سەر پشتە و هەر ئەویشە بەڵادەری راستەقینەی مرۆڤ ‥

**هۆشمەند :** چاك لام ڕوونە ئەوانەی دەست بە ئیسلامەوە ئەگرن ئەبنە خاوەنی رەوشتێکی بەرز ، بەڵام

هەندێ شت هەیە کەوا دڵم سارد ئەکەنەوە تا بڕیاری یەکجاریی بدەم بۆ شوێن کەوتنی ئیسلام ..

**شەماڵ** : ئامادەم گوێت بۆ بگرم و بە پێی تواناش وت و وێژ بکەین .

**هۆشمەند** : بەڵێ ، من ئاواتە خوازم هەموو مرۆڤێ وەك تۆ بژیایە و ئەندامانی کۆمەڵەکەمان وەك تۆ راستیی ویست بوونایە ، بەڵام هەندێ بڕیاری قورئان هەن ، ئێمە لە قوتابخانەدا بە پێچەوانەوە خوێندومانە ، بۆیە من لە رووم نایە بەرگرییان لێ بکەم .

**شەماڵ** : زۆر لام سەیرە کاکە هۆشمەند ئەو بڕیارانە چین ؟! ئەی بۆ من هەستم پێ نەکردوون ؟!

**هۆشمەند** : ئێمە لە قوتابخانەدا خوێندوومانە زەویی خڕە و لە بۆشایی ئاسماندا بێ ئەوەی بە سەر هیچەوە بێت بە دەوری خۆی و خۆردا ئەسووڕێتەوە .

**شەماڵ** : وایە .

**هۆشمەند** : کەچی قورئان وای دەر ئەخا کەوا زەویی وا بە سەر پشتی گایەکی زلەوە و نازانم ئەویش بە سەر

ماسی‌یەوە و ماسییش وا لە دەریایەکی بەریندا !!

**شەماڵ :** کاکە هۆشمەند گیان ئەوە ئەڵێی چی ؟!

**هۆشمەند :** برا خۆ گاڵتە ناکەم ، بە راستمە .

**شەماڵ :** توخوا ئەوە بە راستتە ، کاکە هۆشمەند ؟!

**هۆشمەند :** ئەرێ واللە بە راستمە !

**شەماڵ :** بە خوا سەیرە ! ئەمەت لە کوێ بیست ؟!!

**هۆشمەند :** تۆ وا ئەزانی من لە خۆمەوە ئەیلێم ؟ بە خو لە مووچەخۆرێکم بیست کە هەمیشە حەزی لە کتێب خوێندنەوەیە !!

**شەماڵ :** (بە زەردەخەنەیەکەوە) بە خوا لام سەیرە ! خوێندەوارێك .. مووچەخۆرێك کە هەمیشە کتێب بخوێنێتەوە ئەڵێت : قورئان باسی گاو ماسیی تیایە ؟! (هەناسەیەك هەڵئەکێشێ) ئای .. ئای چەندە بەزەییمان بەو خوێندەوارانەدا بێتەوە هێشتا هەر کەمە؛ خوێندنەوەیەکی قورئانی پیرۆز نییە بە کۆڵی شێرەوە ؟ وا خوێندەواران ساميان لێ نیشتووە و ناوێرن رووی تێ کەن !.. ئەگینا چی تیایە ئەگەر بە سەر پێیەکەوە سەرنجی بدەن ؟

به راستیی زۆر جێگای داخە ، شوێنکەوتوانی هەموو ئاینێکـی پڕوپوچ بـە جـوانـی بـاوەش ئـەکـەن بـە بیروباوەڕەکەیاندا و چاوپۆشیی ئەکەن لە کەم و کوڕیەکانی •• وە نایەڵن کەس لە نهێنیی‌یە پڕ شوورەیی‌یەکانی ئاگادار

بـێ •• کـەچی ئێمـەی موسوڵمان ـ سوپاس بۆ خوا ـ خاوەنی ئاینێکی بێ لەکە و بێ کەم و کوڕیین کەوا بـە ئاشکراو بـە بێ شاردنەوە هـەموو مرۆڤێ ئـەتوانێ لێ‌ی بکۆڵێتەوە •• بگرە ماوەی رەخنە گرتنیشی هەیـە ، کـە شوێنکەوتووەکانی ئـەوەندە نەشارەزان لێ‌ی تا بڕیاری وا بدەن و هەتا شورەیی بێ بە لایانەوە خۆیان بە موسوڵمان بزانن !! ئەمە ئەوپەڕی بەنج کردنە کە دوژمنی خوانەناس پێ‌ی هەڵئەسێت بەرامبەر بە موسوڵمانەکان تا بەناوی نەتەوە و زمان و ڕەگـەز و رەنگـەوە پارچە پارچـەیان بکات و نەهێڵێ لە شوێنی هێز و وزەی راستەقینەیان ئاگادار بن •

لە راستی‌یدا کۆمەڵی شەیتان چەند سەدەیەکە جڵەوی کاروانی گەلانیان بە دەستەوەیە ، جگە لە ئاژاوە و پشێویی و ناکۆکی و خوێن رشتن هیچی تریان نەکرد بۆ ئادەمیزاد،

وە چاك ئەزانن كاتی ئەوە هاتووە كۆمەڵی خوا جڵەوی کاروباریان لێ وەرگرێتەوە •• ئەویش بە شارەزا کردن و تێ گەیاندنی گەلان لە ستەم و جەور و لە سنوور دەرچوونی کۆمەڵی خوێن مژ •• خۆیان ئەزانن ئەمچارە نۆرەی چاك ویستانە تا خوا کۆمەکیان بکا بۆ ئەوەی بدەن بە تەوقە سەری کۆمەڵی خراپ ویستانا و دەست کۆتایان بکەن لە خوێن مژین و دەست بڕین و ئاژاوە نانەوە •• خۆیان ئەزانن هێرشی ئیسلام ئەمڕۆ دژی تاقمە جۆر بە جۆرە خوانەناسەکانە و بە ڕەوینەوەی تەم و دوکەڵی درۆ و دەلەسە و پاگەندەکانیان ، مێشکی ئادەمیزاد بەرەو وەرگرتنی ئیسلامە ، بۆیە وا پەلەقاژە ئەکەن و ئەیانەوێ لە بەر چاوی کۆمەڵی گەنجە خوێنەوارەکان لەکەداری کەن •• ئەوانە هیچیان بۆ نەماوەتەوە بیجگە لە قسەی بێ مانا و درۆ و دەلەسە کە بە چپەوە لە پەنا دیوار و کۆڵانەکانا ئەیدەن بە گوێی نەشارەزاکانی ئیسلامدا •

پەنا بردنی پێری سەرلێشێواو بۆ ئەم جۆرە ئیشە ساویلکانە نیشانەی دڵەتەپەی ئاخر و ئۆخری ژیانی کۆمەڵی

سەرلی شێواوانە .. ئینجا ئەوەش بزانە کاکە هۆشمەند گیان ئەم لێ دوانەم تەنها بۆ ئەو پاگەندە بچکۆلەیە نەبوو کە داویانە بە گوێی جەنابتا .. بەڵکو ئەمەوێ لەم نەخشە گلاوانە تێ بگەی کە کافرانی سەر زەویی کێشاویانە .. تا نەهێڵن ئادەمیزاد ئیسلام ببیستێ و ببینێ - چونکە بە دەرکەوتنی رۆشنایی ئیسلام ئەوان بە وێنەی شەمشەمەکوێرە پێویستە بە خۆیان و دەستە و دایەرەکەیانەوە بخزێنە سووچ و کونە تاریکەکانەوە و لە بەر ئەوەی ئەوان وەك میکرۆبی زیانبەخش وان ، تەنها لە شوێنی پیس و گەنیودا توانای ژیانیان هەیە .

**هۆشمەند** : زۆر سوپاست ئەکەم کاکە شەماڵ گیان بۆ ئەم روونکردنەوەیەت .. بە ووتەکانتا وا دەر ئەکەوێ تۆ بە تەمایت ئیسلام لەمەودوا پەرەبسێنێ و ئادەمیزاد بیکاتەوە بە بەرنامەی ژیانی .

**شەماڵ** : بەڵێ برا ئازیزەکەم ، ئەمە رای من و هەموو شارەزا و تێ گەیشتوویەکی ئیسلامە ..

**هۆشمەند** : بە خوا زۆر سەیر بیر ئەکەیتەوە کاکە

ئـەماڵ •• دوای ئـەوەی بـە چاوی خۆمان هـەر لـەم
دەمەنەماندا کز بوونی ئیسلام ئەبینین و لەو لاوە خراپەکاری
و بێ رەوشتی پەرەئەسێنێ و ئەوانەش بە راستیی دەست بە
ئیسلامەوە ئەگرن و ئێمە ئەیانناسین وەختـە بـە پەنجـەی
دەست بژمێرڕێن ، دوای ئەمە هەمووی بـە تەمای ئیسلام
پەرەبسێنێتەوە ؟!

**شەماڵ :** بەڵێ برا ئازیزەکەم ، زۆر بە چاکی بـەتەمام
چونکە تەنها ئیسلامە ئـەگاتە فریای ئادەمیزاد تا لـە گیرو
گرفتەکانی سەدەی بیستەم رزگاری بکا ، چونکـە ئیسلام
ـ ئەویش بە تاقی تەنیا ـ بریتی‌یە لە رزگار کردن •

**هۆشمەند :** ئیسلام گیر و گرفتەکان چارەسەر ئەکات؟!
**شەماڵ :** بەڵێ •• برا ئازیزەکەم ئەمڕۆ ئەوروپا دوور
لە ئیسلام وەستاوە ، بـە تەماش بوو وڵاتی ئیسلامیشی لێ
دوور بخاتەوە ، وە وەکو جەنابیشت ئەزانی لە زانیاریی و
پێش کەوتندا هەنگاوێکی گەورەی ناوە ، لەگەڵ ئەوشا وەك
زانا بـەرزەکانی دانـی پیائـەنێن لـەوپـەڕی دڵـەتەپـە و
تێر بـەخواردن و چاوچنۆکـیی و تـەمـاع و دڵرەشییدا
ئەژین •

ئەوروپا خوێندەواریی و پێش‌کەوتنی کردە چەك بۆ
چەوسانەوەی گەلە هەژارەکان •• لە جیاتی ئەوەی رێ‌یان
بۆ رۆشن بکاتەوە ••

ئەوروپا بە نەخشــە گڵاوەکانی صەهیۆنی و صەلیبـی
رەوشت و خووی لــە گەلــەکان دوور خستەوە تا مرۆڤی
چاوبرسی و خۆفرۆشی دەستکەوێ و بیانکاتە دوژمنی وڵات
و گەلەکەی •

ئەوروپا دەستی دایــە تاڵانکردنی گەلــە هەژارەکان و
خێر و بێری وڵاتەکانیانی زەوت کرد •
ئەوروپا لە سایەی بیروباوەڕە گەنیوەکەیدا بــە هــەر
کردەوەیەکی نامرۆڤانە هەڵسێ زۆر بە ئازایەتی ئەزانێ •
کورتەکەی : ئــەمڕۆ ئادەمیزاد لــــە ســــەر زەویدا
ئەناڵێنێ ، زامەکانی زۆر بە سۆن •• ئادەمیزادی داماویش
هــەر کــەس بڵێ وەرە لــە گەڵما من تینویەتیت ئــەشکێنم
ئەکەوێتە شوێنی ؟! •• کــەچی دوای دەرکەوتنی درۆ و
دەلەسە وازی لێ دێنێ و ئەگەڕێ بە شوێن رزگارکەردا •
ئەگەڕێ تا دۆستێك تینوویەتی‌ی بشکێنێ •• تا زامــەکانی

دڵ و مێشك و رۆحی تیمار بکا ؛ تا گرێکوێرەکانی ژیانی چارەسەر بکا •

ئا لێرەدا ئەزانین تەنها ئیسلامە ئەو رزگارکەرە •

**هۆشمەند** : تێ ناگەم بۆچ تەنهـا ئیسلام ئـەو کارەی لێ دێ ؟! •

**شەماڵ** : زۆر چاکە •• بۆچ تەنها ئیسلام شۆڕەسواری ئەم مەیدانەیـە و رێبازەکانی تر دەستەپاچەن ؟ لـە بـەر ئەوەی کە ئیسلام بەرنامەی خوایە •• خوای دروستکەر و داهێنەری بوونەوەر نەخشەی کێشاوە ، بۆیـە هـەموو بڕیارێکی یاسایەکی رێك و گونجاوە لەگەڵ بوونەوەر دا•• لەگەڵ پێویستی ئادەمیزاد دا بە گوێرەی ئەو ژیانەی کـە خـوا بـە ئادەمیزادی بـەخشیوە ، بـەپێی ئـەو یاسـا سروشتیانەی کە بۆی رام کردووە •• بە واتایەکی تر : یاسای ئیسلام بەشێکە لەو یاسا گشتی‌یەی کە خوا نەخشەی کێشاوە بۆ بوونـەوەر تا بـەو پێیە بەندایەتی‌ی خۆی بۆ پەروەردگاری بە جێ بێنێ ! ••

بۆیە هەر کاتێ ئادەمیزاد لە سەر رێبازی ئیسلام بوو

ئەوا هەنگاوەکانی دژی یاسای بوونەوەر نابێت ، بەلاّم بەرنامە نەفامی‌یەکان هەموو بڕیارێکیان دژی یاسای بوونەوەرە ئەویش لە بەر بێ ئاگایی و نەشارەزایی دانەرانی ئەو بەرنامانە ..

ئینجا لە راستی‌دا چی بیروباوەڕ و رێباز هەیە لەسەر زەویدا بێ بەشە لە پرۆگرامی پەروەردەیی رێك و پێك کە بگونجێ لەگەڵ ئادەمیزادا تا وەهای رابێنێ بیکاتە مرۆڤێکی دەم و دڵ و دەروون پاك .

**هۆشمەند** : جا ئەمە کەی پەیوەندیی هەیە بە چارەسەر کردنی ئەوەوە ؟!

**شەمال** : هەر تەنها ئەمەیە وا مرۆڤ پێویستیەتی .. چونکە ئەو کۆمەڵەی کە جڵەوی کاروبار ئەگرێتە دەست ئەگەر لەسەر پاکی‌ی پەروەردە کرا ئەوا دەستدرێژ ناکا بۆ گیان و سامان و شەرەفی خەڵکی‌ی .. ئەو کاتە هەموو کەسێ لە پارێزراویی مافەکانی بێ خەمە و زۆر بە رێك و پێکی بە ئەرکی سەرشانی هەڵئەسێ ئیتر لە خۆپەرستیی و هەوەس پەرستیی رزگاری ئەبێ و ئەبێتە مرۆڤێکی دۆست

بە گرۆی ئادەمیی •• هەر کۆمەڵێکیش ئەندامانی لەم جۆرە مرۆڤانە بوون ، هەر کاتێ جڵەوی کاروباریان کەوتە دەست ڕێڕەوەکەی ئەوروپا ناگرنە بەر و دواکەوتوویی و خەواڵوویی گەلان بە هەل نازانن بەڵکو دەستی یارمەتییان بۆ درێژ ئەکەن تا چاویان بکرێتەوە ، و ڕاستییان بەر چاو کەوێ و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە شوێنی کەون •

جا هەر مرۆڤێ شوێنی ئیسلام کەوێ وا خۆی و مرۆڤەکانی تریش بەرەو حەسانەوە و ئاسایش ئەبات •

کورتەکەی ئەوانەی هەوڵی قیامەت ئەدەن وا پەلەقاژێ و هەڵپەی نابەجێ ناکەن بۆ ئەوەی لەسەر حسابی مەردومەکان ژیانی خۆیان خۆش کەن ؟ هەوڵ نادەن گەلان بخنکێنن و تالانیان بکەن بۆ ژیان و گوزەرانی خۆشی خۆیان و پیر و چینەکانیان •• هەوڵ نادەن قڕ بخەنە مرۆڤایەتییەوە تا بەرژەوەندی خۆیان بێتە دیی و بازاڕی دەستکردەکانیان گەرم بێت ، سەر زەویی ناکەنە گۆمی خوێن بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی ناڕەوایان ، بەڵکو بە پێی نەخشەی پەروەردگار کە ئادەمیزادی کردووە بە جێنشینی خۆی و بوونەوەری رام کردووە بۆی •• ئەچێ بە ڕێوە ،

ئـەوسا ئـەبینی لـە شـوێن هـەموو کردارێکـی خـراپی خوانەناساندا چاکەیەك بە دەستی بەندە راستەقینەکانی خوا جێ بە جێ ئەکرێت •• چونکە موسوڵمان هەموو هەوڵ و کۆششێکی بۆ رەزامەندیی پەروەردگار و بە دەست هێنانی اشترین پلەی بەهەشتە •

**هۆشمەند :** بە خوا سەیرە •• دە توخوا حەیف نی‌یـە رێ لـە بیروباوەڕی وا بگیرێ ، بـە راستی‌ی ستەم کارن ئەوانەی دژی بانگ‌کەرانی ئیسلام ئەوەستن ••

**شەماڵ :** دژ وەستانی بێ باوەڕان و رێ‌گرتن لە بانگی خوا و کوشتن و ئازار دانی موسوڵمانەکان لە هەموو کون و قوژبنێکی ئەم سەر زەوی‌یەدا بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە لە سەر ئەوەی کە تەنها ئیسلام ئەتوانێ گەنج و خوێندەوار لە خۆی کۆ بکاتەوە •• دڵان رۆشن بکاتەوە •• مێشکیان پاك بکاتـەوە و رزگاریان بکا ؟ ئینجـا لـە ئەنجاما قـەڵای زۆرداران بڕمێنێ و دەستی دەستدرێژکەران لە بنا ببڕێت• بۆیە ئەوانیش درێغی ناکەن لێی ، چونکە لایان روونـە مرۆڤە چەوساوە و مافخوراوەکان ئاگادار ئەکاتەوە و مافی راستەقینەیان ئەخاتە پێش چاو •• رەوشت و رەفتی بەرزیان

ێنر ئەکات •• ئەیانکاتە پیاوی مـەرد و قارەمان تا گیانیان
بکەنە قوربانی بۆ رزگار بوونی مرۆڤ•• هەموو مرۆڤ••
لە سەرانسەری زەوی‌یدا •

**هۆشمەند** : خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە کاکە شەمال گیان ، بە زانینی ئەمانە ، پرسیارێکی تر دێت بە سەرما •• ئەویش ئەمەیە : بۆچ بانگە نەفامیەکان زوو پەرەیان سەند و بانگی ئیسلامی‌ی لـە سـەر خۆ هـەنگاو هـەڵئەگرێ و شوێن‌کەوتووی کەمە ؟!!

**شەمال** : راستە بانگی نـەفامی زوو پەرەئـەسێنێ و بانگی ئیسلامەی‌ی لە سەر خۆ چونکە :

یەکەم: بانگی ئیسلامی‌ی بینا کردنەوە و بانگی نەفامی‌ی روخاندنە ، واتە ئیسلام بـەماوەیەکی دوور و درێژ ئینجا پەروەردەی راستەقینەی مرۆڤ ئەکات و خۆپەرستی و خۆ ویستی لە دڵ و دەروونیا ریشەکەن ئەکا ، بـەڵام بانگی نەفامی هەر ئەوەندەیە کاری حەرام و نەشیاو و زیان‌بەخش لە ناو کۆمەڵا بڵاو بکاتەوە •• ئینجا ئەو وەفا و بەڵێن و چاونەترسی‌یەی کە ئیسلام لە موسوڵمانی ئەوێ بەو پەلـە

بەلە دەست ناکەوێ و ماوەیەکی زۆری ئەوێ تا مرۆڤ بگاتە ئەو پلەیە ، بەڵام کۆمەڵی نەفامی درۆ و دەلەسە و ساختە و دەس برِین پیشەیەتی وە کۆمـەڵی دواکەوتوو و نەفامیش لەم جۆرە ئەندامانەی بە لێشاو تیایە •• چونکە نەخۆشی بە کۆمەڵایەتی یە جۆر بە جۆرەکان ریشەیان داکوتاوە و بـە بەروەردەی شەیتانیی خەڵك راهاتووە ••

**هۆشمەند** : دیارە رووخاندنیش ئاسـانترە لـە بینـا کردن ، ئەمە زۆر راستە •

**شەماڵ** : دووەم : بانگی ئیسلامیی بانگـی خوایـە ، خواش ئەوەی پاك نەبێت نایەوێت ، بۆیە ئیسلام هەر وەك خەڵکیی را ئـەکێشێ بۆ ناو کوورەی زاخـاو دان لـەو سەرەوە کۆمـەڵ کۆمەڵ شوێنکـەوتووی بەرگەنەگر و زاخاو نەدراو دەر ئەپەڕێن و لە ئیسلام دوور ئەکەونەوە ، ئـەویش دوای تاقیکردنـەوەیان و دەرکـەوتنی نیـاز و مەبەستیان •• بەمـە تـەنهـا ئـەوانـە ئـەگـەنە مـەنزڵ کە دڵ و دەرونیان بە پاکی بەسترا بێ بە خواوە بەڵام بانگە نەفامی یەکان زۆر بێ و بۆر بێ ئامانجیانە ••

سێیەم : بانگە نەفامی یەکان لەگەڵ نەخوێندەواریی و

دواکەوتن‌دا دەست لە ملی یەکن •• هەموو بانگێکی نەفامی زیاتر لەناو چینی دواکەوتوودا بڵاو ئەبێتەوە •• هەروەها ئەو شوێنانەی کە زۆر ستەم دەوری تیا دیوە ، خەڵکەکە ئەوەندە تینووی رزگارکەرن هەرکەس بڵی من رزگارکەرم پێیە و چوار قسەی لووسیان بۆ بکات باوەڕی پێ ئەکەن •

**هۆشمەند** : دەی بۆچ موسوڵمانەکان لەم جۆرە شوێنانەدا ئیسلامیان پێش‌کەش نەکرد بەو هەژارانە تا ئەو دەست بڕانە نەیان خەڵەتێنن ؟!

**شەماڵ** : پرسیارەکەت زۆر جێی خۆیەتی •• چونکە ـ رەنگە نەزانیت ـ لە زۆربەی شوێنا ، بە ناوی ئاینەوە بەدەستی ئەوانەی ئاینیان کردبووە چەك بۆ پارێزگاریی پایەو پلەی ستەم کاران دژی هەژار و چەوسان ، ستەم ئەکرا لە داماوان •• ئەو رۆژە هەڵگری ئیسلام ئەو دەست بڕانە بوون ، ئەوانەی بە سەر ئیسلامەوە ئەژیان و ئەم نەبوایە بەرات و کەوا و سەڵتەی نیوداشتیان دەست نەئەکەوت و لە برسا ئەمردن ، خۆ هەر شوێنێ موسوڵمانی چاوکراوەی تیا بوو بێ ، ئەوا دەستی خۆیان وەشاندووە و

بانگی خوا هەنگاوێکی باشی ناوە ..

ئەو دەست بڕانە کە بە سەر ئاینەوە ئەژیان یا ئەوەتا نانبی زەکات و سەر فیترەی خۆیان بوون ، یا ئەوەتە دواکەوتوو مێشك بەنج کراو بوون کە کەسیان پێوە خەڕۆ نەبێ وە یا بەکرێ گیراوی لایەنێکی بێگانەی دوژمن بە ئیسلام بوون ، وە یا هەندێکیان لە بنەڕەتدا ناموسوڵمان بوون ..لەژێرەوە فێری زمان و هەندێ زانیاریی ئاینی نەبوون بۆ دەست بڕین ئینجا خۆیان ئەکرد بە شێخ و مەلا .. وە یا خۆیان ئەکرد بە خزمەتکاری شێخ و بەگ و میرەکان تا دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر ئیسلام لە کۆمەڵ دوور خرایەوە و ئاخنرایە سووچی مزگەوتەوە ، ئیتر مەپرسە لەو درۆ و دەلەسە و بیرە پڕو پوچانەی کە بە ناوی ئاینەوە بە ناو خەلکی نەخوێندەوار و بێ ئاگادا بلاو ئەکرایەوە تا موسوڵمانەکان وایان لێ هات لە بت پەرستی‌یەوە زیاتر نزیك بن تا لە ئیسلامی راستەقینەوە .

کەواتە لەم جۆرە شوێنانەدا بانگە نەفامیەکان زیاتر بلاو ئەبنەوە چونکە ئەوانە بریتین لە چاو بەست کردن و بەس.

بەڵام بانگی ئیسلامی گەنجی چاوکراوەی خوێن گەرمی
ڕەوشت بەرزی ئەوێ •• بۆیە زۆری پێویستە تا ئەو بناغە
یەوە دروست بێ ؟ تا بە کەڵکی ئەوە بێت ئیسلام بینای
بە سەرەوە بکات •

چونکە مێشك و دەروونی بەنج کراو لە ئیسلام تێ
ناگات ، زیاد لەوەیش چونکە خۆرئاوای خوێن مژ هەڵگری
ڕاینارێی و شارستانی‌یەتە ڕوکەشەکەی بوو ، بەم بۆنەوە
هەرچی لار و وێر بوو بەو ناوەوە بە ناو موسوڵمانەکاندا
بڵاوی کردەوە •

**هۆشمەند :** منیش شتێکی ترم هەر لە دوورەوە هەست
پێ کردووە : کەوا بانگی ئیسلامی‌ی ناتوانێ هەموو هۆ و
ڕێگایەك بە کار بهێنێ بۆ ڕاکێشانی خەڵکی •• چونکە بە
پێی شەرع هەرچی قەدەغە بێت ئەوە بۆ بڵاوکردنەوەی
ئیسلام ناشێت ، بەڵام بانگە نەفامی‌یەکان چاك و خراپ
نابژێرنەوە ، هەموو هۆ و ڕێگایەك ئەگرنە بەر بۆ فریودانی
خەڵکی تا شوێنیان کەوێ •

بانگە نەفامی‌یەکان ڕەوشتیان نی‌یە •• شوورەیی لێك

نادەنەوە •• چونکە خوێنمژین مەبەستیانە •• خەڵەتاندن و چاوبەست کردن پیشەیانە •

**شەماڵ :** ئافەرین کاکە هۆشمەند گیان ، هەموو دەروونێکی پاك لە خۆیەوە پەی ئەبا بە هەندێ بیری ئیسلامی‌ی بەر لەوەی ببیستێت •• بەڵام ئەوەشت لە یاد بێ زۆر لە دڵسۆزان دوای دەرکەوتنی ساختە و درۆ و دەنەسە وازیان لێ دێنن و هەروەك بە ماوەیەکی کەم بەڕدئەسێنن ، بە ماوەیەکی کەمیش تیا ئەچن • ئەمەش کاتێ کە خەڵکی‌ی بە دەست کردەوە ناشیرینەکانیانەوە بێزار ئەبێ •

لە لایەکی ترەوە ئەگەر سەرنجێکی دەیان ساڵی پێشەوە بدەین ، بۆمان دەرئەکەوێ جیهانی ئیسلامی‌ی چۆن لە دواکەوتوویی‌دا ئەژیا و خوێنمژە کافرەکانیش بە صەلیبی و صەهیۆنیەوە چۆن نەخشەی گڵاویان ئەکێشا بۆ لە ناوبردنی ئیسلام ، ئەویش بە گەورەکردن و شۆڕەت پەیدا کردن بۆ چەند بە کرێگیراوێکی گوێ لە مشتی خۆیان تا بیانکەنە گەورە و ناوداری میللەت • وە زۆر

پیاوی چاکویستیش لەبەر تێ نەگەیشتنیان لە ئیسلام ئەبوونە پالپشت بۆ بانگی نەفامی‌ی ٠٠ بەلام ئەمەش هەر تیاچوونی بە دواوەیە ، چونکە ئەو غیرەت و وزەیەی لە ناو موسولمانەکاندایە و ئەوان کەلکی لێ وەرئەگرن ، تەواو ئەبێت ، وە چونکە ئەو بانگە نەفامی‌یانە بانگی بەرەلایی و بێ رەوشتی و بێ غیرەتی و بێ وەفایی و خۆپەرستین ، بۆیە یەکسەر دوای ئەوان چینێکی دەست بڕو ساختەچی‌ی بەیدا ئەبێ و زیان لە خەلکی‌ی تال ئەکات و خەلکیش لە بیروباوەڕەکان پشت هەلئەکەن ٠٠ هۆکەش هەر ئەوەیە رێبازە شەیتانی‌یەکان پرۆگرامی پەروەردە و رەوشتیان نی‌یە ، وە مرۆڤ ئەکەنە دوڕندەیەکی تێر نەخواردوو و چاوچنۆك و دلرەش و بێ‌وێژدان ، ئەیکەنە دڕندەیەك تا چاوە زاقەکانی تەنها بەرژەوەندیی تایبەتی‌ی خۆی ببینن و دلە رەشە بە گوناه داپۆشراوەکەی تەنها خۆی خۆش بوێت و بەس ٠

دیارە کۆمەل هەر رۆژێك ئەبێت هەست بەمە بکات و هەلگرانی ئەو بیروباوەڕەی لەبەر چاو سووك بن ، بەلام بانگی ئیسلامی‌ی هەر کاتێ بە پاکی‌ی و پوختەیی هەلبگیرێ

و هەڵگرانی لەبەر خوا دەستی بدەنێ : یەکەم خوا پاڵپشتی ئەکا و دڵی گەلـە چەوساوەکانیش بـە رەوشتی بـەرزیان را ئەکێشن •

لە لایەکی ترەوە بانگی ئیسلامی‌ی راستی‌ی و پاکی‌ی و بێ کەم و کورپیەکەیەتی وا لە هەموو چەرخ و شوێنێکا بە بەردەوامی‌ی هەتا خوا کۆتایی دێنێ بە ژیان ، لە هەموو گـەل و نەتەوەیـەك گـەنجی خوێـن گـەرم و دڵسۆز و دڵپاك •• پەروەردە ئەکات ، لەو لاوە بانگە نەفامی‌یەکان تەنها لە کاتێکی دیاری کراوا ئەتوانن دەستی مرۆڤ ببرن، بەڵام کە ساختە و رووکەشی‌یان دەرکەوت بە یەکجاری‌ی دوایان ئەبرێتەوە و ئەبنە پەندی زەمانە •

**هۆشمەند :** من ئەوەشم لا روونە کەوا پێڕی شەیتان بە بیانووی دواکەوتوویی و بێ کەڵکی‌یەوە ئیسلام تاوانبار ئەکەن •• لە کاتێکا ناتوانن تاقە لاری‌یەکی ئیسلام بخەنـە روو ، ئـەوەندە زۆڵ و سـاختـەچین دواکـەوتوویـی و نەخوێندەواری‌ی بـە ناو موسوڵمانەکان و پـەڕپووتی‌ی و رزیوی‌ی کۆمەڵگە بەناو ئیسلامی‌یـەکان ئـەکەنـە دەست

پێچێك بۆ دوور خستنەوەی خەڵكی لە ئیسلام ، لەو لاوە هەرچی ئایینی تر هەیە هەمووگیانیان هەر كەم و كوورِی یە و بیروڕای هیچیشیان نە لەگەڵ زانیاری یا ئەكونجێ و نەعەقڵ پەسەندی ئەكا ، دوژمنانی مرۆڤایەتی ی نایەن رەخنە لەو ئایینانە بگرن وە یا لێیان بدوێن ، وە یا خراپی و لاری ی و دواكەوتنەكەیان باس بكەن ..
بەڵكو بە پێچەوانەوە لەگەڵ ئەوەدا كە ئەو هەموو تەشەرو توانجەی ئەگیرێتە موسوڵمانە دڵسۆزەكان و ئەو هەموو پیلانە گڵاوانە كە نەخشە ئەكێشرێن بۆ فەوتاندنی ئیسلام ، دێن لایەنی ئایینە پووچ و دەستكاری كراو و بێ سەر و بنەكان ئەگرن ـ كە هەڵگرانیان شوورەیی یان لێ دێ بە ئاشكرا باسیان بكەن ـ وە پەرەیان پێ ئەدەن .. وە شوێن كەوتووەكانیشیان هیچ شەرمێ ناكەن هەردەمە و حزبەتكاری ی لایەكی دەست رۆیشتوون تا كۆمەكی بكەن بۆ چەسپاندنی بەرنامە لار و وێرەكەی .

كاكە شەماڵ گیان من بە هەستی خۆم هەستم بەمە كردووە لە ناوچەی خۆماندا ، جا نازانم رای جەنابت چۆنە ؟! .

**شەماڵ :** زۆر راستە کاکە هۆشمەند گیان ‥ راستە مشتێك نموونەی خەروارێکە ، لە هەموو شوێنێکی ئەم سەر زەوی یەدا خوێنمژانی مرۆڤایەتی ی دژی هیچ ئایینێك ناوەستن جگە لە ئایینی ئیسلام ، چونکە ئەوان ئەتوانن هەموو ئایینێك ـ جگە لە ئیسلام ـ بکەنە پرد بۆ پەڕینەوە و گەیشتنیان بە ئامانج ، ئیتر ئەو ئایینانەش تەنها بەم جۆرە پشتگیری یانە بەندن ئەگینا ئەوانە وەك هەوری هاوین وانە کە بەرگەی تینی خۆر ناگرێ و خێرا تەفر و توونا ئەبێت .

**هۆشمەند :** من هەست ئەکەم ئەم هەموو پێرە بێ ئیمانانە یەك دەست یاری یان پێ ئەکات ، بەڵام بۆچ وا لە نێوان خۆیاندا ناکۆکن ؟!!

**شەماڵ :** کاکە گیان ‥ ئەمانەی کە ئێمە بە ناکۆکیان ئەزانین ساختەی دیوی دەردوەیە ، بەڵام لە ژێرەوە هەموو یەك بنەڕەتن ، ئینجا وا بەم دەستە دەستە و تاقمە تاقمە خەڵکیان فریو داوە و ئەم مانگ و ئەو مانگ وە ئەم ساڵ و ئەو ساڵی پێ ئەکەن ، بە ناوی چارەسەریی وەزعەوە ، تا چارەسەریی راستەقینە نەدۆزرێتەوە ‥ وە ئەو گیروگرفتانەی کە دێنە رێی بە شێوەیەکی خوار و خێچ

نەخشــەیان بۆ بکێشێ ، ئــەگینــا ســەیر کــە بۆچ تــەنها موسوڵمانەکان و پێشەواکانیان کوشتن و بڕین بــەشیانە ٠٠ بۆچ گەورەیەکی بێ ئیمان نافەوتێ ؟!! چونکە ئەمانە زۆر بە کەڵکن بۆ خوێن مژان ، ئەگەر ئاژان ملپێچی‌ی فەرمان بکــەن بزانــە بــە ماوەیــەکی کــەم کورسی‌یەکانیان لــێ ئاسەنرێتەوە ؟

جا پارێزگاری کردنی هەڵــوەڕێنــەرانی نەفامی‌ی لــە لایەن ئاغاکانیانەوە شتێکی ئاشکرایە ، وە یەك بۆ یەکتری‌ی، پشتگیرن ٠

ئینجا هــەموو جارێك کــە بەکرێ‌گیراوێك ئەخرێتــە مەیدانەوە ئاغاکانی فەرمانی پیا ئــەدەن کــەوا خۆی بــە دۆستی ئیســلام پیشان بدات ، تا بــاش خۆی بگــرێ ٠٠ ئەوسا کە دەستی گیر بوو ، بەوپەڕی دوڕندەیەتی‌یەوە بدا لە ئیسلام و هەڵگرەکانی ٠٠ وە هەموو ڕێگایەك بگرێتە بەر تا چەنێ ئەتوانێ بەربەستی بانگی ئیسلامی‌ی بکا ٠٠ بەڵام ئــەو جۆرانــە هــەموویان ساویلکــەن ، نازانن خۆیان و دەســەڵات و پایــە و پلــەیان کۆتایی پــێ دێ و بــەندە

چڵكاوخۆره‌كانی ده‌ور و به‌ریشیان كاسه‌لێسی لایه‌كی تر ئه‌گرنه ئه‌ستۆ ، كه‌چی بانگی ئیسلامیش وه‌ك شاخی دامه‌زراو ئه‌وه‌ستێ .. وه هه‌ر جارێ كه یه‌كێكیان ده‌وری نۆكه‌ریی بێ ته‌واو ئه‌كه‌ن و دووری ئه‌خه‌نه‌وه ، بانگی ئیسلامی‌ی كۆمه‌ڵێكی دڵسۆزی چاو كراوه رائه‌كێشێ دوای ئه‌وه‌ی كه بۆیان ده‌رئه‌كه‌وێ ته‌مه‌نیان به فیرۆ به‌خت كردووه له نۆكه‌ری‌ی كافردا ..

**هۆشمه‌ند :** به‌ڵام چۆن هه‌موو موسوڵمانێك بزانێ كێ راست ئه‌كا و كێش موونافیقه ؟

**شه‌ماڵ :** زۆر ئاسانه كاكه هۆشمه‌ند گیان ..

یه‌كه‌م : هه‌ر كه‌سێ به پاكی‌ی روو بكاته خوا ،خۆیشی به خۆی نازانێ كه چۆن خوای گه‌وره ئه‌یخاته سه‌ر رێگای راست ..

دووه‌م : ئه‌وانه‌ی كه به راستی‌ی هه‌وڵ بۆ ئیسلام ئه‌ده‌ن ته‌مه‌نێكیان له‌و باره‌وه بردۆته سه‌ر و جێ ده‌ستیان دیاره له خزمه‌تكردنی ئیسلامدا .. به‌ڵام موونافیقه‌كان ئه‌م

سات و ئەو سات بڕیار دەرئەکەن بۆ پشت گیریی هەر
بڕ و باوەڕێك ..

سێیەم : کە زۆر گرنگە و پێویستە موسوڵمان ساتێ لە یادی نەچێ ، ئەوەیە کە ئیمڕۆ دەستی کافر لە کاردایە ، وە ئاگاداری هەموو هەڵس و نیشتێکە لە جیهاندا، کەواتە ئەزانێ کێ هەوڵی ڕاستەقینەی بۆ ئیسلامە و کێش بە سەریەوە کاسپیی ئەکات ، لەبەرئەوە هەر کە بانگێکی ئیسلامیی ڕاستەقینەی بە دی کرد کەوا لە پەرەسەندنایە، ناچار ئەبێت خێرا لێیدا .. لێیدا بە هەر شێوەیەك بووە ، بۆ ئەم کارە هەموو شوورەیی و عورف و عادەت و یاسایەك ئەخرێتە ئەو لاوە .. چونکە بە لای ئەوانەوە یاسا بریتی‌یە لە پارێزگاری مافی کافر !!

کەواتە بانگی ئیسلامیی ڕاستەقینە بە ئاسانی ناگاتە ئەنجام ، وە یا ماوەی جم و جوڵ و چالاکی نادرێت ، ئینجا ئەم ئایینە خوایی‌یە بێ گەردە تا ئێستە کەسێ نەبووە بە ساختەوە دەستی پێوە بگرێ و بۆ ئادەمی‌یەکان دەر

نەکەوێ •• چونکە خوا پشت گیریی ناکات و بە هێزی خۆی لە ناوی ئەبات •

بەڵێ •• کاکە هۆشمەند گیان ، ئاینی خوا ئیسلامە •• ئیسلامیش بێ گەردە •• درۆزن و لە سنوور دەرچووان تا سەر لە سایەیا جێیان نابێتەوە •

**هۆشمەند** : زۆر کەس وا دێت بە بیریا کە ئەو ناوچانەی سەربەستیی تەواویان تێدا نییە ، تەنها لەوانەدا ئیسلامەتیی ماوە ، واتە ئەگەر هەموو بیرووباوەڕ و بێ رەوشتیەك ماوە بدرێ •• خەڵکیی لە ئیسلام دوور ئەکەوێتەوە •

**شەماڵ** : ئازیزەکەم ، ئەبێ لە بیرمان بێت ئەم پەت و پەت کارییە هەمووی بە دەستی بێگانەی کافرە ••

ئینجا ئەوەشت لە یاد بێت کافر هەموو رێگایەکی بە کار هێناوە بۆ تواندنەوەی ئیسلام ـ ئەم ئاینەخواییە ـ هەموو هۆیەکی بە کار هێناوە بۆ دوور خستنەوەی مرۆڤ لە ئیسلام ، بەڵام تا ئێستە سوپاس بۆ خوا لە هەموویانا هەر دۆڕاو بووە و هەر بانگی ئیسلامیی لە پەرەسەندندا بووە •

ئەگەر دوژمنایەتی لەگەڵ ئیسلامدا ئەکرێت ئەم زیاتر لە دڵی ئادەمیزادا جێی خۆی ئەکاتەوە ، وە ئەگەر شوێنکەوتووەکانی ئازار ئەدەن ؛ ئەمان زیاتر سوور ئەبن لەسەر قوربانیی دان ..

وە ئەگەر پەرە بە کۆمەڵە سیاسییە کافرەکان ئەدەن ، هەر ماوەیەکی کەم دەوام ئەکەن ، خێرا ئەکەونەوە بە درۆوە ؛ وە ئەگەر فەساد و خراپکاریی ئەخەنە ناو کۆمەڵەوە ، هەر ماوەیەك خەڵك شوێنی ئەکەوێ ، ئیتر بەرە بەرە غیرەت ئەجووڵێ و باوەش ئەکرێتەوە بە ئیسلاما .

**هۆشمەند** : ئەمە زۆر راستە .. بەڵام کاتێ خەڵکی ئەگەڕێتەوە بۆ لای ئیسلام ، هێشتا هەر کۆمەڵێکی رۆشنبیر دانابەزن ، ئەوان نازانم بۆ پەشیمان نابنەوە ..

**شەماڵ** : کاکە گیان .. ئەوانە جۆر جۆرن ، هەندێکیان لە کاتێکا دڵیان گەرم بووە دژی ستەم و ناڕەوا ، وایان هەست کردووە کە ئەو کۆمەڵە دواکەوتوەیان بە ئیسلام ردنت ئەکات و ؛ تاوانی ئیسلامە وا ستەم پەرەی سەندووە

•• ئەوانە بەو بیر و هەستە سادەوە مێشکیان بەستوویەتی و تازە هیچی تر وەرناگرێت •

وە هەندێکیان دەستی خەڵکی زۆری بڕیووە و درۆی زۆری لە گەڵا کردون و بە ناڕەوا زۆر دژی ئیسلام دواوە ؛ ئێستە بە شووزەیی ئەزانێ بگەڕێتەوە !
وە هەندێکیشیان لە بەر بەرەڵلایی خۆیان تواناى ژینی ژێر سێبەری قورئانیان نی‌یە ، بەلام زۆربەی هەرە زۆریشیان لەو کەڕە عەوامانەن کە بە هیچ شێوەیەك تواناى شت خوێندنەوەیان نی‌یە ، وە تواناى ئەوەیان نی‌یە لە بیر و هۆشی بەرز تێ بگەن •

**هۆشمەند :** راستە • بەلام هەندێکیان خەریکی گۆڤار و رۆژنامە کڕینن لە کتێبخانەکاندا ••

**شەماڵ :** تۆش راست ئەکەی ئازیزەکەم •• بەلام سەرنجیان بگرە زۆربەیان خەریکی خوێندنەوەی گۆڤارە بێ رەوشتەکانن ، تاك و تەرایان نەبێ ئەچن بە دەوری گۆڤارە زانیاری‌یەکانا ، ئەوانیش وە نەبێ ئەو زانیاری‌یەیان تیا بێ کە مێشکی مرۆڤ لە نۆکەرێتی کافر رزگار کا ••

ئەوانیش هەمان نەخشەیان بۆ کێشراوە : کە بریتی‌یە لـە بەنج کردنی مێشکی زانیاری ویستەکان تا زیاتر خۆیان و گەلەکەیان بە شوێنکەوتەی ئەوروپا بزانن •

**هۆشمەند** : بە خوا راست ئەکەی شـەمال گیان •• بێگانەی خوا نـەناس داینـاوە ئەوانـەی شتی بێ‌رەوشتیان ئەوێ بە گۆڤارە سووکەکان ئەیانکاتە بـەندەی خۆی ، وە ئەوانەش لە بـەر خۆیانەوە پێشکەوتوو خواز و زانیـاری ویستن بە ناوی زانیاری‌یەوە •• بەمە وای لێ دێ بە ناو رۆشن‌بیرەکان هـەر خەریکی مۆدێل و مۆدێل‌کاری‌بن و وەك بێچوویەکی بێ دەسەڵات چاوەڕێی ئەوروپا بن •

**شەمال** : (بە نەرمی‌یەوە و بـە زەردەخـەنەوە لـێ‌ی وەرئەگرێت) تا خۆراکی ئامادەی پڕ لە ماددەی ترسنۆکی‌ی و بەندایەتی‌ی بنێرێت بۆیان ••

**هۆشمەند** : کەوابوو ئەمانە هیچ نرخێك نە بۆ خۆیان و نە بۆ بیر و هەستیان دا نانرێت •• وە هەتا بەرەڵڵایش بەرەبسێنێ ئیسلام دۆستەکان زیاتر رێزی ئیسلام ئەکرن و باوەشی پیا ئەکەن •• وە دیارە کـە کافر لەمـەشـا سـەر

نەتەوت دەست ئەداتــە دروست کردنــی ناکۆکی‌ی ؛ وە ئاژاوە و دووبەرەکی‌ی ئەخاتە نێوان گــەل و نەتــەوە و وەچەکانەوە ٠٠

**شەمال** : ئەوەشت لە یاد بێت ؛ کاکە گیان ٠٠ کــە پڕوپاگەندەیەکی یەکجار گەورە ئەکرێت دژی ئیسلام ، بە تایبــەتی‌ی لــە لایەکــەوە کــە جێ‌ی گومــان نــەبێت • بەڵام ئێمە بەوە زۆر دڵخۆشین ئــەو سەردەمەی کــە بــە کوێرانە حوکم ئەدرا دژی ئیسلام ، وا لە تەواو بوندایە و سوپاس بۆ خوا ؛ ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لا بە لای ئیسلامەوە ئەکرێت • وە درۆ و پاگەندەش هەر ماوەیەك توانای دەست بڕینیان هەیە •

**هۆشمەند** : خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە کاکە شەماڵ گیان ، بە راستی وتە شیرینەکانت بوونە چرای ڕێگا ڕۆشن کردنەوە بۆم و دڵ و دەروونم فێنك بوویەوە •

**شەمال** : کاکە گیان ٠٠ ئەمە رای من نی‌یە ، بــەڵکو شتێکی سەلماو و دیارە •

**هۆشمەند** : خوا پاداشتت بداتەوە شەمال گیان ٠٠ خوا کۆمەك بێت لەمەو لا دەست ئەدەمە خواپەرستی و ژیانم

ـ ئەگەر خوا ویستی لە سەر بوو ـ تەرخان ئەکەم بۆ خزمەتی گرۆی ئادەمیزاد ؛ لە سەر بناغەی رێبازی ئیسلام •

جا ئێستە من کاتی رۆیشتنمە و داوات لێ ئەکەم ماوەم بدەی ، ئیتر خوات لەگەڵ ••

**شەماڵ :** خوات لە گەڵ بێ براکەم •

**[ هۆشمەند لای شـەماڵ هەڵسا ‥ خوا وای رێك خست دوای چەند هەفتەیەك چاوی کەوت بەسێ قوتابی هاوڕێی لە چایخانەیەکدا بوون‥ ویستی سەلامێکیان لێ بکات و بڕوا ‥ بەڵام هاوڕێکانی لە جیاتی وەڵام دانەوەیەکی نەرم و نیان ، کردیان بە قاڵە : فەرموو دانیشە ، بـە سەری ئێمە دا ئەنیشی ، هەر یەکەیان بۆ خۆی ئەیقیڕاند و هۆشمەندیش حەزی ئەکرد وازی لێ بێنن و بڕوا بـە لای ئیشی خۆیـەوە ‥ بەڵام سوور بوونی ئـەم لە سـەر رۆیشتن ، دادی نەدا و بە زۆر پەلیان گرت و بە سوێند دایان نا ] .**

**کامەران :** یا خوا بـە خێر بێی ، کاکـە هۆشـمەند گیان ، زۆر چاودێڕی هاوڕێیەکی تری وەکو جەنابت بووین تا ببین بە چوار کـەس و دۆمینەیـەکی چوار قۆڵی لێ بکەین ‥

**ئاسۆ :** بە خوا راست ئەکا ، ماوەیەکە نەمان کردووە٠

**هۆشمەند :** بەڵام من بڕیارم داوە هەر شتێ کەلکی تیا نەبێ وازی لێ بێنم ؛ وە لە بەر ئەوەی من ئێستا قوتابیم زۆر پێویستیم بە کات هەیە تا بتوانم وانەکانم ئامادە بکەم٠

**سامال :** کاکە هۆشمەند ؛ ئەمە یەك ئەم جۆرە وشانەت لێ ببیسم ٠٠ کەڵك ٠٠ قوتابیی ٠٠ کات ٠٠ وانە ٠٠ !! سەرم سوور ئەمێنێ !!

**هۆشمەند :** راست ئەکەی براکەم ٠٠ بەڵام مەرج نی یە ئادەمیزاد هەتا هەتایە لە سەر هەڵەی خۆی بەردەوام بێ ٠

**کامەران :** ئینجا ئێمە هەڵەمان چی یە ؟! هەربۆ ئەوەی سەعی ناکەین ؟! هیچ کەس سەعی ناکات ٠٠

**سامال :** نەوەڵڵا ٠٠ جگە لە پیری شەمال ئەفەندی هیچ کەس تاقەتی سەعی و کتێبی نی یە ٠٠

**ئاسۆ :** کاکە هۆشمەند ، ئەگەر هەر حەزیشت لە زانیاریی و سوود وەرگرتنە ٠٠ گۆڤارێکی تازەم کڕیوە هەتا نیوەشەو بە دەستەوە بێت لێی بێ تاقەت نابی وە

ئەگەر لە دەرنەچوونیش ئەترسی ، بڕوات هەبێ پار مـن لە هەشت وانەدا کەوتبووم سەری ساڵ کرابوویە یەك وانە و دەوری دووەم پاڵیان پێوە نام ر دەرچووم ••

**سامال :** خۆ بە تەماش نیت بچیت بۆ زانکۆ •• ئەوە هەموو کون و قوژبنە و خۆتی پیاکە و •• ئا ••

**ئاسۆ :** ئەترسم کاغەزی تاقی کردنەوەیەکی شەماڵی دی بێ و دڵی چووبێتە سەر نمرەکانی ، وا نی‌یە ، کاکە هۆشمەند گیان ؟؟!

**[ ئـەم هەموو وت و وێژە کرا ، هۆشـــمەند هـەر بێ دەنگ بوو •• تا بزانێ مەبەستیان چی‌یە ؟ چی‌یان پێ‌یە هـەڵیڕێژن دەرهەق بـە شەمال و برا موسوڵمانەکانی ] •**

**هۆشمەند :** کاکە گیان نمرە ئەوەندە گرنگ نی‌یە •• مرۆڤ خەمی بۆ بخوا •

**سامال :** بە خوا هۆشمەند ببێ و نەبێ لەگەل شەمال و دەستە و دایەرەیا دانیشتوویت •• سەیر کـە چۆن ئێر

بووه لـه سـەر خۆ قسـه بکات هـەر خۆی بـه هـاوەڵی ئێمەش نازانێ •

**کامەران :** خۆ منیش دڵم لێی پیس کردووه ، یەك دوو جار دیومه هاتوچۆی مزگەوتی کردووه ؛ لـەوه ئـەچێ نوێژیش بکات ، وا نی‌یه هۆشمەند ؟

**هۆشمەند :** جا برا گیان بۆچ تاوانه موسوڵمان لـه وڵاتی ئیسلامدا بچێته مزگەوت و نوێژ بکا ؟!!

**کامەران :** (بە پێکەنین و گاڵتەوه) ئینجا تاوان لەوه زیاتر هەیه ؟!

**ئاسۆ :** ئەمەیه داوای پێش‌کەوتن و رزگاریی ئەکرد !

**سامال :** (دەنگ بەرز ئەکاتەوه) •

تەواوه ، خۆیەتی ؛ شـەماڵ و پێرەکەی مێشکی ئـەمیشیان بەنج کردووه و قوڕیان بۆ گرتۆتەوه ••

**هۆشمەند :** (بە هێمنیەوه) بـه پێچەوانەوه ؛ مێشکم پاك کراوەتەوه و هیچ قوڕێکیشم بۆ نەگیراوەتەوه •• من بەزەییم بـه ئێوەدا دێتـەوه ؛ چۆن ژیانێکه ئێوه ئەیبـەنه سـەر !!

**کامەران :** ئێمە ئیشی خۆمانمان رێك و پێك کردووە ، وەکو تۆ سەر لە خۆمان ناشێوێنین •• ئێمە هەر ئەوەندەیە دوا رۆژێکی باش مسۆگەر کەین •

**هۆشمەند :** (بە تەشەرەوە) جا مەگەر بە دۆمینە و بۆکەر مسۆگەری کەن !•

**سامال :** تۆ تەشەر ئەدەیت ، بەلاّم ئێمە بە راستمانە •• تۆ برۆ لەگەڵ شەماڵ و ئەوانا هەر سەعی بکە و ئێمەش هەر بەم شێوەیە ، بزانین کاممان شەهادەکەمان بەرزتر ئەبێت •

**هۆشمەند :** شەهادەی بەرز دەستی زیرەك و لێهاتوو ئەکەوێت •

**ئاسۆ :** سەیری کەن ئەڵێی هێشتا لە چەرخی بەرددا ئەژی •

هۆشمەند ؛ هۆشمەند •• زۆر چاك بزانە ئەوەی تۆ دەستت داوەتێ سەرەنجامی بۆشە ••

**هۆشمەند : تێ ناگەم !! ••**

**کامەران :** من تێت بگەیەنم •• تۆ ئەتەوێ شوێن

ئیسلام بکەویت و بەس ؛ ئێمەیش ئەمانەوێ لەهەر کوێ با بوۆ لەوێ شەن بکەین •• جا بزانە کاممان قازانجمانە •

**ئاسۆ** : بە تەمایە بە سەعی رووت شـەهادەی دەست کەوێ •

**هۆشمەند** : من چاك ئەزانم ئێوە بـە تـەمای چین ، بەڵام من هەر رێگایەك دڵم پەسەندی نەکات •• هەتا هەتایە دانی پیا نانێم ••

**سامال** : دە برۆ بخۆن لەگەڵ شەمال ئەفەنی‌یا •

**هۆشمەند** : من نامەوێ هـەول بدەم بۆ بەرژەوەندیی تایبـەتیی خۆم ؛ چونکـە ئادەمیزاد پێویستە خـەم خـۆری کۆمەڵەکەی بێت ، پێویستە بەرژەوەندی‌یە تایبـەتی‌یەکانی واز لێ بێنێ لە پێناوی رێگای راستا •

**کامەران** : (روو ئەکاتە ئاسۆ) ، سامال ئەڵێ قورپیان بۆ گرتۆتەوە کەچی خۆی دانی پیا نانێ ، وا ئەزانن هەروا بەم چەند گەنجە نوێژگەرە ئیسـلام ئـەخرێتـەوە کۆڕی ژیان ، قورتان بە سەر •• کافران ئەوەندەش دەستەپاچـە نین بێڵـن ئێوەمـانان پـەرەبسێنن ؟ هـەموو بیروباوەڕێـك

دەوڵەتێکی گەورە وا لە پشتیەوە و ئەیپارێزێ ؟هەژارە !! .
خۆ ئێوە هەموو دنیا دوژمنتانە •

**[ هۆشمەندی هـەژاری کـەم زانیاریی کەوتە گێژاوی بیر کردنەوە •• بە وتەکانی کامەران کـەمـی و کـەم هێزیـی موسوڵمانـەکان و دەسەڵات و چەکداریی کافرە خوا نەناسەکانی ئەهێنایـە پێش چـاوی خـۆی ، کامـەران و هاورێکانیشی زۆر چـاك ئەمـەیان لە دەم و چاویا ئەخوێندەوە ، بۆیە سامالیش بە هـەلی زانی ؛ ئەویش بە وشەیەکی ساختەی دەستبڕ دایگرتەوە •• ]**

**سامال :** ئەوە شتێکە هەموو کـەس ئاگای لێیـەتی دەگەرهەژارێ وەك هۆشمەندی داماو کـەوا بـە بێ ئاگا تۆلی لە بنا بڕاوە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ ؛ چونکە لە هـەر شوێنێکا کۆمـەڵێك بیانەوێ هـەوڵ بدەن بۆ زیندوو کردنەوەی ئیسلام ، خێرا دەوڵەتـە کافرەکان داوێکیان بۆ ئەنێنەوە تا لە هێزیان بخەن ••

**ئاسۆ :** بە راستی وایە ، ئەمرۆ هەوڵدان بۆ ئیسلام

خۆماندوو کردنە ؟ هەر چەندە بیروباوەڕێکی ڕاستیش بێت ، بەڵام بێ ئەنجامە و خۆ لە ناوبردنە بە بێ هوودە ٠٠ بە تایبەتی‌ی کە بەشێکی زۆر لە موسوڵمانەکان وازیان لە ئیسلام هێناوە و بە جارێ پشتیان تێ کردووە ٠

**[ هۆشمەندی داماو لەگەڵ وشە ژەهراویەکانی ئەوانا ، ئەچووە قووڵایی بیر کردنەوە و لە بەر نەشارەزایی و کەم ئاگایی خۆی بڕوای پێ نەکردن ٠٠ لە بیرکردنەوە دا چاوی زەق بوو بوون ، کە زانی‌یان گەنجی دڵپاك وا تێك چووە و لە دەریای ئەندێشەدا مەلە ئەکات ٠٠کامەران بە زەردەخەنەیەکی فێڵبازانەوە دەستی دا لە پشتی هۆشمەند و بێداری کردەوە ] ٠**

**کامەران :** ئێ‌ی کاکە هۆشمەند !! با تێ بگەی دنیا چۆنە ٠٠ تۆ وا ئەزانی ئێمە ئاگامان لە هیچ نی‌یە و بە بێ هۆ وازمان لە ئیسلام هێناوە ٠٠ هەزارە ، وا بە ئاسانی ئەماڵ و پیرەکەی ماوەیان نادرێتێ ئیسلام بڵاو بکەنەوە ؟ چونکە بستێ زەوی‌ی نی‌یە وڵاتە گەورەکان دەستیان نەڕوا

به سەریا •• هەر چۆنێ بێت بە پیلان و نەخشەی خۆیان ئاسایی ئەگەنە ئاواتیان و بانگەوازی ئیسلام ئەتوێننەوە !!••

**[ هۆشمەند سەری لەم وشانە سوڕ مابوو ، بەرە بەرە هەستی بە ناو چاو گران بوو و بێ هێزیی لاشەی ئەکرد •• تاقەتی نەما لە ناو هاوڕێکانیا لەمە زیاتر بمێنێتەوە ، بۆیە بە دژواری یەکەوە و بە لاشەی گرانەوە هەڵسایە سەر پێ و بە ملێکی کەچ و ناوچاوێکی بە یەکا هاتووەوە داوای مۆڵەتی لێ کردن تا بڕواتە ماڵەوە ] •**

**هۆشمەند :** بە یارمەتی خۆتان •• پێویستیم بە حەسانەوە هەیە هەست بە ناتەواویی لاشەم ئەکەم ••

**هەموویان :** باشە فەرموو •

**هۆشمەند :** بە خواتان ئەسپێرم ••

**هەموویان :** خوات لەگەڵ •

**[ هۆشمەند تۆزێ دوورکەوتەوە ، بە جارێ هەرسێکیان دایانە قاقای پێکەنین ] ••**

**سامال :** هەتیوە کەرە ، بە تەمایە بەم سەر و نەساڵەیەوە دژی زانیاریی و پێشکەوتن بوەستێت •

**ئاسۆ :** ئە ئاوا سەری گێژ ئەکەین ..
ئیسلام ئیسلامیان دنیای پڕ کردووە .. وا ئەزانن هەنگیان
دۆزیوەتەوە .

**کامەران :** چەکی راستەقینەی ئێمە ئەوەیە لە هەموو
جۆرە پاگاندەیەك شارەزا ببین و هەرکەسە و بەپێی
خۆی مێشکی تێك بدەین .. ئەمانە ئاوا زوو نەگەیتە
فریایان دوایی هیچ نابیستن و بە کەس کۆڵ نادەن ..

**ئاسۆ :** ئۆخەی ، صەد ئۆخەی .. ئەمە جارێ
ئەکێکمان لێ گێژ کردن ؛ هەرکامتان چاو پێ کەوت بە
زمانی لووس بیکەنە هاوڕێی خۆتان تا بەرە بەرە پەشیمایەنی
کەینەوە .

**سامال :** ئەمانە زۆر سەیرن ؛ شەو و رۆژ پەڕاو
ئەخوێننەوە .. نازانم چۆن هیلاك نابن !!

**کامەران :** ئەی کێ نەگبەت بێت .. کاکە زۆر دانیشتین
وا بزانم وەختی هەڵسانمانە ..

**ئاسۆ :** ئەرێ وەڵلا ، با هەڵسین .

[ **هەر سێکیان هەڵئەسن** ]

## ـ ٣ ـ

**[ بە یانیەکیان شـەماڵ و پشتیوان چـاوەڕێی پاسیان ئەکرد ] ٠**

**پشتیوان :** ئەرێ کاك شـەماڵ ماوەیەکـە هۆشمەند نابینم بێت بۆ مزگەوت ٠٠

**شەماڵ :** راست ئەکەی ؛ لە قوتابخانەشدا نایەت بە دەورماندا ، هەروەکو گیروگرفتێکی گەورە رووی تێ کرد بێ و پێوەی پەشۆکا بێ ٠٠

**پشتیوان :** ئەترسم کەسێکی ناساغ بێت ٠

**شەماڵ :** خوا بکا هۆشمەند هیچی نەیەتە رێگە ، بە راستیی نمونـەی گـەنجی ناو چاو پاك و دڵ و دەروون پاکـە ٠

**پشتیوان :** خوا کۆمەکی هەموومان بێت ؛ بە راستی

ئەگەر هۆشمەند سەری لێ نەشێوێنن تا بە جوانیی لە ئیسلام شارەزا ببێت ، ئەبێتە نمونەی موسوڵمانی چالاك و گورج و گۆڵ .

**شەماڵ** : وا چاکە دوای هەموو نوێژێك بە تایبەتیی بۆی بپاڕێینەوە تا خوا هیدایەتی بدا و لە سەر ئیسلام دامەزراو بێت ..

**پشتیوان** : دیارە ئەمەش کارێکی شەرعییە و پێویستە رۆژانە لە یادمان بێت ، وە ئەمە یەکێکە لەو هۆیانەی کە موسوڵمان پێویستە بە کاری بێنێ ، چونکە هیدایەت دان بە ویستی خوایە و موسوڵمان لە سەری پێویستە کە بە رێك و پێکی ئیسلام را بگەیەنێت بە خەڵك و داوا لە خوا بکات کە دڵ و دەروونی تێ نەگەیشتوان بکاتەوە بۆ وەرگرتنی ئیمان و ئیسلام ..

**[ لە ناکاو هۆشمەند دەر ئەکەوێ و هەردووکیان بە زەردەخەنەیەکەوە ئەچن بە پیریەوە .. هۆشمەند ماوەی بوایە خۆی دوور ئەخستەوە بەڵام کە گورمیشیان بوو ، لە بەر ئەوەی**

**حـەزی لـە رووشـكێنی نـەبوو ‎٠٠‎ وە هیچ كاتێكیش بـەخراپ بـەر چاوی نەكەوتبوون ؛ ناچار بە زۆر زەردە خـەنەیەكی خستە سـەر لێوی و هات بە دەمیانەوە ] ‎٠٠‎**

**هۆشمەند :** السلام علیكم ‎٠‎

**هەردووكیان :** و علیك السلام و رحمة الله وبركاته ‎٠٠‎

**شەماڵ :** كاكـە هۆشـمەند گیـان ماوەیەكـە كـەم دەرئەكەوی ، كـە دەریش ئەكەوی ماتەمین ئـەكەویتـە بەرچاومان ‎٠‎

**هۆشمەند :** بڵێم چی ‎٠٠‎

**شەماڵ :** ها ئێستە لەگـەڵ كاكـە پشتیواندا باسی ماتـەمینیی جـەنابتمان بوو ؛ ئـەترساین خوانـەخواستە گیروگرفتێكی گەورەت هاتبێتە رێ ‎٠‎ جا ئێمەیش دڵمان لە خۆمان دا ئەمێنێ ، كە ئێمە ئەوەندە تۆمان خۆش بوێت و بەشدارمان نەكەیت لە چارەسەركردن و بە تەنگەوە چوونی هەر تەنگ و چەڵمەیەك كە بێتە رێگات ؛ چونكە ئێمە برای موسوڵمانی یەكین لـە برای باوك و دایكیی پێویستە لـە پێشتر بین ‎٠‎

**[ پاسەكە لە دوورەوە دەر ئەكەوێت ]**

**هۆشمەند :** کاکە گیــان خوا پاداشــتی دڵپاکیتیــان بداتەوە ، بە راستیی هەر ئێوە خەمخۆری هەموو کەسێکن نەك تەنها من ؟ بەڵام وا پاسەکە دەرکەوت و ئــەوەی لــە دڵی منایە بەم پەلە پەلە باس ناکرێت •• ئەگەر خوا ویستی لــە ســەر بوو سەعات چواری ئێوارە ســەرت لێ ئەدەم ؛ پێشم خۆشە کاکە پشتیوانیش لەوێ ئامادە بێت •• چونکە بە وێنەی سەربازی موسوڵمان وازی هێنا ، تا جەنابت بــە ناوی هەردوکتانەوە وت و وێژ بکەیت ، لەگــەڵ ئەوەشــا هەروەك لە وشەکانی جەنابت تێ گەیشتم ، وەهاش لە دەم و چاوی پاکی گــەشاوەی ئــەویشا دڵسۆزی و وەفاداریی برای موسوڵمانم بە دی ئەکرد •

**[ پاسەکە ئــەوەستێت و هــەرسێکیان ســوار ئەبن ] •**

## - ٤ -

**[ شەماڵ لـە نزیك دەرگـای حەوشـەكـە دا ژوورێكی تەرخان كرد بوو بۆ برا میوانەكانی تا هـەر كاتێ سەریان لێ دا ؛ بە سەربەستی دانیشـن و وت و وێژی خۆیـان بكـەن ·· شـەماڵ چـاوەڕێی پشـتیوان و هۆشـمەندی ئەكرد ؛ ·· تا یەك لە دوای یـەك تەقەیان دا لە دەرگا و شـەماڵیش پێشوازیی لێ كردن و هاتنە ژوورەوە · ]**

**شەماڵ :** ئەمجاریش یا خوا بە خێر بێن ·

**هەردوكیان :** خوا پاداشتی چاكەت بداتەوە ·

**شەماڵ :** بە راستیی موسوڵمان وەك برای یـەكن ؛ پێویسـتە جاروبار یـەكتریی ببینن تا بـە راو تـەگبیری هەموویانەوە نەخشەی رێك و پێك بكێشن ، بۆ ئەوەی بزانن چۆن خزمەتی ئاینەكەیان بكـەن · چونكە موسوڵمانەكانی

سەردەمی پێغـەمبەر ـ صلی الله علیه و سلم ـ ئەو کاتـە خۆیان بە ئیماندار ئەزانی کە پێکەوە دانیشن و خۆیان لـە ئاینەکەیان شارەزا بکەن ••

**پشتیوان :** زۆر راستە کاکـە شـەمال گیان ، ئـەو موسوڵمانەش لە کۆمەڵی موسوڵمانەکان بپچرێت وەك مەڕی بە جێ ماو وایە کە هەمیشە گورگ لەو جۆرانە ئەخوات •• وە موسـوڵمان پێویستە ئاگـای لـە داو و تەڵەکـەی دوژمنان بێت وە ئەگەر تەنگ و چەڵەمەیەکیش رووی تێ کرد بە تەنیا نەچێتە ژێر باریەوە نەوەکو بەرگەی نەگرێت بە تەنها خۆی چارەسەر نەکرێت ؛ چونکە خوا بۆیە برای موسـوڵمـانی بـەو بـەخشیوە تا خـەمخۆری بـن و بـە هانایەوە بچن ••

**هۆشمەند :** ئازیزەکانم •• ئەزانم مەبەستی وتەکانتان منی غەمبار و دڵزوارە •• داوا کارم خوای گەورە پاداشتتان لە سەر ئەم دڵ و دەروونە پاکە و ئەم رەوشتە بەرزەتان بە چاکترین شێوە بداتەوە •

وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کـە بەم ئیسلامە بێگەردە

وا ئیوەی بەم دڵسۆزیی و وەفاداریەوە پێ گەیاندووە ••

ئازیزەکانم •• من هیچ گیروگرفتێکی خۆیم نی‌یـە ، ئەمە یەك •• بەڵام ئەوەتە چـەند ساتێ لـە ئێوە بڕام و تووشم بوو بە تووشی کۆمەڵێك قوتابیی نەفامەوە ،مێشکمیان پڕ کرد لە گومان و دوو دڵیی ••

خۆ من چاك ئەزانم تەنها ئیسلام ڕێبازی راستە ، وە تـەنهـا موسـوڵمـانیش خـاوەنی پـەروەردە و رەوشـتی راستەقینەیە ••

**پشتیوان :** جا تۆ ئەمەت لە دڵا جێگیر بوو بێ ،گومان و دوو دڵی چۆن لێت نزیك ئەبێتەوە •

**شەماڵ :** کاك پشتیوان راستەکا ••
کامەیە ئەو گومانەی کە دراوە بە گوێتا ؟ بەڵکو ئێمـە بتوانین وەڵامت بدەینەوە ••

**هۆشمەند :** لە راستییدا ئەو رۆژە کامەران و ساماڵ و ئاسۆ لە چایخانەیەکا دانیشتبوون ، ویستم لا نەدەم ؛ بەڵام بە زۆر لایان پێ دام •• بەرە بەرە باسەکەیان گۆڕی بۆ سەر دوارۆژی ئیسلام و موسوڵمانەکان تا هەندێ گومانیان

خستە دڵمەوە •• منیش بە جارێ دنیا لە بەر چاوما تاریك بوو ؛ هەرچەندە هـەوڵم لەگـەڵ خۆما دا هیچ سـوودی نەبوو •• وە هـەر چۆنێ لێکم ئەدایەوە سـەرم لێ‌ی دەر نەچوو •• ناچار پەنام بردە بەر تەنیایی ، هەتا شەرمیشم ئەکرد باوەڕ کردنم بەو گومانانە و کارکردنیان لـە سـەر بیر و هۆشم بۆ ئێوە باس بکەم ••

**شەماڵ** : هـەر تۆ تووشی گیروگرفتی بێ چارەسـەر نەبوو بی •• خوا کۆمـەك بێت ، گومان و دوو دڵی‌ی و پاگەندەی ناحەزان بایەخێکیان نی‌یە ، چونکە پێش هەموو شتێ ئیسـلام بێ لـەکەیـە •• وە دواڕۆژیش بـە دەست خوایە ، ئێمـە بڕوامان لەسەر ئەمە دامـەزراوە ، بـەڵام حەزیش ئەکەین بە درێژد باسەکەت لێوە بیستین •• تا ئێمەش بزانین چۆن وەڵامت بدەینەوە •

**هۆشمەند** : ئەوەیان بـاس ئـەکـرد کـەوا کـافران ئـەوەندەش دەسـتەپاچـە نین کـەوا بێڵن موسوڵمانـەکان پەرەبستێنن ، چونکە هەموو بیروباوەڕێك دەوڵەتێکی گەورە وا لـە پشتیەوە و ئەیپارێزێ ، وە هـەموو جیهان دوژمنی

موسوڵمانەکانە •• ئینجا ئەمڕۆ هەوڵدان بۆ ئیسلام خۆماندوو کردنە و بێ ئەنجامیشە ••

**شەماڵ** : کاکە هۆشمەند گیان ئەم پاکاندانە هەر هیچیان تیا بە سەر نی یە ، ئێمە شتێك لەمە دواوین لە ڕۆژە رابردووەکانا ؛ بەڵام لەوە ئەچێ بە جوانیی دڵت ئاوی نەخواردۆتەوە و بە وردیی لێی نەگەیشتوویت •• وە پێویستی بە شیی کردنەوەی زیاتر هەیە •

**پشتیوان** : کاکە شەماڵ گیان •• بە یارمەتی خۆت ماوە هەیە ؟

**شەماڵ** : فەرمو کاکە پشتیوان گیان ، ئێمە بۆیە حەزمان کردووە تۆیش لە گەڵمان ئامادە بیت تا بەشداریی بکەیت جا پێویست ناکات خۆت کەنار بگریت ••

**پشتیوان** : خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە کاکە شەماڵ گیان •• لێرەدا حەز ئەکەم ئەوە بڵێم بە کاك هۆشمەند ئەوا پێش هەموو شتێك هەرکەسێ ویستی لە لایا دژی ئیسلام بدوێ •• وە یا ویستی لای پێ بدات ، ئەو ئەم بڕیارە بدا و بڵێ من جارێ ئەوەندە شارەزای ئیسلام نیم کە حوکمی لە سەر بدەم ، وە پێویستە بە شێوەیەکی

گشتیی لێی تێ بگـەم ؛ ئەوسا وت و وێژ لەگەڵ ئـەم و ئەودا بکەم ••

**شەماڵ** : زۆر راستە کاکە پشتیوان گیان ؛ ئێمـە تا لە ئیسلام شارەزا نەبین پێویست ناکا بەرگریشی لێ بکەین، چونکە جاری وا ئەبێ ئەو بەرگرییە زیانی زیاتر ئـەبێت لە قازانج ••

**هۆشمەند** : منیش خـۆم زۆر بێزاری دەمـە دەمێ و گفت و گۆی بێ سوودم ؛ چونکە هەرگیز ئیسلام کـەڵکی بێ وەرناگرێ و موسوڵمانیش کاتی بە فیرۆ ئەچێ و بەرە بەرە کاری سەرشانی موسوڵمانی لە بیر ئەچێتـەوە ، کـە بریتییـە لـە هیدایـەتدانی سـەرلێشێواوان و ڕونـاك کردنەوەی دڵ و مێشکیان بە ڕۆشنایی ئیسلام ، وە دەسـت ئەداتە دەمە دەمێ و بەزاندنی بەرامبەرەکەی جا لـە بـەر کەمیی زانیاریی جاروبار بە گیر ئەودستێ و تێر پێی پـێ ئەکەن ، وە ئەگەر جارێکیش بۆی هات وەڵامێکی گونجاوی دایـەوە ؛ وا فیزی پێوە ئـەکا نـە بەرامبـەرەکـەی لێی وەرئەگرێ ، نە خواش پاداشتی ئەداتەوە لە سەری ••

**شەماڵ :** کاکە هۆشمەند گیان .. ئەی تۆ بۆ سەرنجی ئەو نەخشە گلاوانەی لەمەو پێش ناگریت ؟ کە کافران بە هەموویانەوە نەخشەیان کێشابوو بۆ لە ناو بردنی ئیسلام.. یەك دوو صەدە خەریك بوون تا ئیسلامیان وا لێ کرد کە تەنها ئەو چەند لق و پۆپە وشکەڵەیە کە بە دەست شێخ و مەلاوە ئەیبینین .. ئینجا چینێکی بە ناو خوێندەواریان پەروەردە کرد ؛ تا بە جارێ پشت هەڵکا لەو ئایینەی دەستی شێخ و مەلا و واش بزانێ ئەمە ئیسلامی راستەقینەیە ..

بەڵام کە تۆ ئەمرۆ سەرنجی هەموو کون و قوژبنێکی جیهان ئەگریت کەوا ئەو هەموو گەنجە خوێندەوارە رووی کردوتە ئیسلام ؟ ئایا سەرت سوڕ نامێنێ کە ئەمانە چۆن ئەو نەخشە گلاوانەیان پووچەڵ کردۆتەوە ؟! .

کەی کافری خوانەناس بەمە رازی‌یە ؟!!

رازی بێ و رازی نەبێ نەخشەی خوایە .. ویستی خوایە .

هەروەهاش سەرکەوتنی ئیسلام .

بە درێژایی مێژوو هیچ هێزێکی خواناس دەسەڵاتی و

توانای نەگەیشتۆتــە دەســەڵات و توانای هێزی کۆمــەڵی شەیتان ..

ئازیزەکــەم .. ســەرنجی قورئان بگــرە و چیرۆکی ڕۆرانبازی نێوان دەستەی پێغەمبەران و دەستەی ستەمکاران بهێنەرە بــەر چاوت ، کامیان بە هێز و دەســەڵاتی دیار و بێراو سەرکەوتوون ؟!

ئێمە ئەگەر بمانەوێ بــە بیری خۆمان ئەنجامی زۆران بازی نێوان ئیسلام و نــەفامی لێك بدەینــەوە ، بــە جارێ سەرمان لێ ئەشێوێ ، ئێمە کە موسوڵمانین ، بۆ ڕەزامەندیی خوا موسوڵمانین .. فەرمانی پەروەردگارمان بە جێ دێنین .. ئەمانەوێ خۆمان لە سزای سەختی ڕۆژی قیامــەت ڕزگار بکەین .. ئەگەر خوا ویستی لە سەر بوو ، ئێمە بەندەی بەدی هێنەرمانین ..

ئازیزەکەم ، هیوادارم بێ تاقەتیی نەکەیت ..

**هۆشمەند :** خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ، کاکــە جەماڵ گیان ، هــەموو ئەندامانم ئامادەن وشە ڕەنگینەکانت بیستن .

**شەماڵ** :گیانەکەم ٠٠ هەر چەندە لە مەککەدا قورئانی پیرۆز دەری ئەبڕێ کە ئەم ئیسلامە بەرنامەی رزگاری کەرە بۆ ئادەمیزاد و ناردنی پێغەمبەریش ـ صلی اللە علیە و سلم ـ رەحمەتە بۆ دانیشتوانی تێکڕای سەر زەویی ؛ لەگەڵ ئەمەشا بە هیچ شێوەیەك مژدەی سەرکەوتنی نەئەدا بەو موسوڵمانانەی کە لە ژێر ئازاری قورەیشی ستەمکارا ئەتلانەوە ٠٠ بەڵکو ٠٠ مژدەی تەنها بەهەشت بوو ، هەتا کاتێك دانیشتوانی مەدینە پەیمانی دووەمی عەقەبەیان لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستا ـ صلی اللە علیە و سلم ـ بەست٠٠ پاش ئەوەی هەموو مەترسی‌یەکی رێگا خرایە پێش چاویان کەوا لە سەر ئەم بیروباوەڕە هەموو جیهانی خوانەناس ئەبێتە دوژمنیان ، پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلی اللە علیە و سلم ـ بەڵێنی بەهەشتی ئەدانێ ئەگەر پەیمانەکەیان ببەنە سەر ٠٠

**پشتیوان** : ئەمە وا ئەگەیەنێ موسوڵمان ترازووی تایبەتی‌ی خۆی هەیە تا کێشانە و پێوانەی پێ بکات ؛ ئیتر ناگونجێ هیچ ترازوویەکی تر بە کار بێنێ ٠٠ پێویستە لە قورئان و فەرموودە بیر و هەست و لێکدانەوەی خۆی

هەڵگۆزێت •• پێویستە نەخشەکانی قورئانی پیرۆزی لە بەر چاو بن ، بۆ دروست کردن و پێ گەیاندن و پەروەردە کردنی کۆمەڵی موسوڵمان ••

**شەماڵ** : زۆر راستە کاکە پشتیوان گیان •• زۆر پێویستە ئێمە بە نەخشەی قورئان بیر بکەینەوە •• چونکە هیچ پێغەمبەرێك نەیزانیوە چۆن سەر ئەکەوێ ؟ وە هەر چۆنی لێکدابێتەوە نەگەیشتۆتە ئەنجام •• بۆ ئەمە پێغەمبەری خۆشەویستم دێتەوە یاد ، کاتێ ئەچێت بۆ « طائف » تا بەشکوم خەڵکەکەی شوێنی کەون و پشتیوانی لێ بکەن و موسوڵمانەکان بە دەست قورەیشەوە رزگاریان ببێت • کەچی لە جیاتی پێشوازیی کردن لێی ، بەردبارانی ئەکەن و هەرزە و نەفامەکان هەڵئەنێن بۆ ئازاردانی ••

**پشتیوان** : ( دڵی دێتە جۆش و بە قووڵی بیر لە ئازار و ناڕەحەتیەکەی پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلی الله علیه و سلم ـ ئەکاتەوە و هەناسەیەك هەڵئەکێشێ ) خوایە یارمەتیت •• پێغەمبەری نازدار ـ صلی الله علیه و سلم ـ ئاوا ئازاردراوە لە سەر ئیسلام ، کەچیی ئێمەی گوناه بار

و تاوانبار ، ئاماده نین بچوکترین شت بێته ڕێگامان ڕەنگە نیزیش بەوەوە بکەین کە ئێمە قوتابیی قورئانین (هەناسەیەکی تر هەڵئەکێشێت) •

**شەماڵ** : براکانم ؛ ئەمەی وتم ئەوە ناگەیەنێ ئیسلام نایەوێ دەسەڵاتی هەبێ ؛ بەڵکو بانگکردنی بۆ ئەم مەبەستەیە •• تا دەسەڵاتی قورئان پێ بگا و خەڵکیی لە سایەیا بحەسێتەوە ••

ئینجا هەر وەك خوا ویستی ئەندامی موسوڵمان و خێزانی موسوڵمان دروست ببێ و دوژمنی کافر هیچی پێ نەکرا ؛ هەر کاتێ ئەو ئەندام و خێزانانە توانیان کۆمەڵێکی موسوڵمان پێکەوە بنێن ، گرنگ نییە گەورە بێت یا بچوك •• وە ئەو کۆمەڵە لە تاقی کردنەوەکانی خوادا دەرچوو وە بە خەڵکی سەلماند کە هەموو شتێ لە پێناوی بیروباوەڕدا هیچە ؛ ئەو کاتە شیاوی سەرکردایەتی ئەبێت و خوا پایەی پێ ئەدا ئەگەرچی هەموو کافر و بتپەرستەکانی سەر زەویی ناڕازیی بن •• خوایە و

دەسەڵاتی هەموو شتێکی هەیە ، هێز نی‌یە بەری دەستی بگرێ ...

**هۆشمەند** : ئەمە وا ئەگەیەنێ کە موسوڵمان بۆی نی‌یە بیر لە چۆنیەتی سەرکەوتنی ئیسلام بکاتەوەو خەفەتی بۆ بخوا .. نابێ بچێتە ژێر بیرکردنەوەی وەهاوە .. چونکە ئەمە کاری سەرشانی موسوڵمانان نی‌یە ..

**شەماڵ** : بەڵێ ، موسوڵمان نەخشەیەکی رێك و پێکی دەستکردی پەروەردگار وا لە بەر دەمیا و پێویستە لە سەری بڕوا .. جا چەنێ لە ئیسلام شارەزایی هەبێ زیاتر ئەتوانێ لە سەر نەخشەکە بڕوا و کەمتر هەوا و ئارەزوو ئەم لاو ئەو لای پێ ئەکەن ..

**پشتیوان** : لە لایەکی ترەوە سەرکەوتنی بیروباوەڕ مەرج نی‌یە بەو شێوەیە بێ کە خوا موسوڵمانان سەرخا بە سەر کافراندا ، بەڵکو بریتی‌یە لەوەی کەوا موسوڵمان واز لە بیروباوەڕەکەی نەهێنێ و بە هیچی تری نەگۆڕێتەوە ئەگەرچی گیانیش بێ .. سەیر کەن کاتێ ئیبراهیم پێغەمبەر - سەلامی خوای لێ بێ - کە ئەبرێ بۆ ناو ئاگرەکە، ئەبێ بە ترازووی زەویی چۆن بیر لە سەرکەوتنی

ئیبراهیمی تاکــه موســوڵمان و بیروباوەڕە خوایی‌یــە بــێ گەردەکەی بکەینەوە ؟ کێ بە تەمایــە ئیبراهیم نەسوتێ و رزگاری بێ ؟!! خۆ مەرج نی‌یە موسوڵمان هەموو جارێ رزگاری بێ •• بــەڵام لێرەدا ئەمەمان ئەچێتە دڵەوە کــە کۆڵنەدانی ئیبراهیم و واز نەهێنانی لــە بیروباوەڕەکەی و ئامادە بوونی تا لە پێناویا بخرێتە ناو ئاگری بڵێسەدارەوە ، ئەوپەڕی سەرکەوتنە •• چونکە هەرکــەسێ بە ویژدانەوە سەیری ئەم هەڵوێستە بکا ، راستی و پاکی رێبازەکەی لــە قوڵایی دڵیا ئەسەلمێ ••

**شەماڵ :** زۆر سوپاس کاکە پشتیوان ، لــە لایــەکی تریشــەوە ســەرکــەوتنی بیروباوەڕی ئیســلامی گــەنجی خوێن‌گەرم لــە سەر خۆشویستنی ئیسلام و راهێنانیان لــە سەر خواناسیی ودڵ و دەروون پاکی و ڕەوشتی بەرز پێ ئەگەیەنێ • ئیتر گرنگ نی‌یە زۆر بن یان کەم •• بەڵکو گرنگ ئەوەیە تێ گــەیشتنەکەیان لــە قووڵاییەوە بێت و بەردەوام بن لە سەر خۆ چاك کردن ، نەك گاڵە و هاشــە و گڕ و فڕ •• هــەرکاتێ ئەم بناغەیــە بــە ڕێك و پێکی پەروەردە بوو و پێ گەیشت وە لە تاقی‌کردنەوەدا ســەری

ئیسلامیان بەرز کردەوە ، خوا پشتیوانیان ئەکات و بیروباوەڕەکەیان گەشە ئەکا و بە هەموو لایەکدا پەڕ و باڵ بلاو ئەکاتەوە .

**هۆشمەند :** زۆر سوپاس کاکە شەماڵ گیان ؛ ئێستە پرسیارێك دێت بە بیرما ..

**شەماڵ :** فەرموو .

**پشتیوان :** بە یارمەتی خۆتان بەر لەوەی باسەکە بگۆڕین من شتێکی تر دێت بە بیرما .

**هۆشمەند :** فەرموو .

**پشتیوان :** براکەم ، کاکە هۆشمەند گیان ، ئەوەشت لە یاد بێ هەتا نەفامی زیاتر ریشکی دا کوتابێ و زیاتر نالاو و سوێراوی بە ئادەمیزاد چەشتبێ ، ئینجا جیهادی ئیسلامی زیاتر بەرهەمی ئەبێت ؛ وە گەنجی چاکتر پەروەردە ئەکات و ئەوانیش چاکتر بۆن و رەنگیان لە ناو کۆمەڵدا ددر ئەکەوێت ، چونکە ئەو کاتە مرۆڤەکان زیاتر پێویستییان بە ئیسلام ئەبێت .. خەڵك زیاتر شەیدای راستی ئەبن .. ئا لەو کاتەدا ئیسلام ئەگاتە فریای دڵە سەرگەردانەکان و

ئارامیی گیـانیی و دەروونـی‌یان پێشـکەش ئـەکـات ٠٠ رزگاریـان ئـەکات لـە نـەفامی و جـەور و سـتەمی بتـە ئادەمی‌یەکان ٠٠

**هۆشمەند :** ئە ئاوا بـە ناو پێشکەوتوو خوازان رای ئەکەیەنن کە ئیسلام دەوری نەماوە ؟!!

**پشتیوان :** بەلێ ؛ هەلیان بە دەست هێناوە ، ئـەم کۆمەڵە دەست بڕە بـە ناو موسوڵمانە ئەکەنـە بەرهەمی ئیسلام و دەروون نەخۆشەکانیش ئەکەنـە دوژمنی و بـە بەڵێنی ساختـە مێشکیان پڕ ئەکـەن ؛ کەوا ئـەوان ژیانی خۆش گوزەرانی‌یان پێشکەش ئەکـەن ٠٠ بـەڵام ٠٠ وا بەرە بەرە ساختە و دەست بڕینەکانیان ئاشکرا ئەبن ٠
جا ئێستە کاك هۆشمەند فەرموو بزانین پرسیارەکـەت چیی بوو ؟

**هۆشمەند :** ئەمانەم بە دڵە ٠٠ بەڵام من هەر چەندە بیر ئەکەمەوە ناگەمـە ئەنجامێك تا دڵم رازیی بێت کـەوا ئیسلام چـۆن ئـەم هـەموو هێزە کافرانـە بـەزێنێت و سەرکەوێت ؟

**شەماڵ** : کاکە هۆشمەند گیان ؛ وە نەبێ تەنها تۆ بیرت لەمە کردبێتەوە ، وە یا یەکەم کەس بی کە دوژمنان ئەم پاگەندەیە بدەن بە گوێیا .. بەڵکو هەموو موسوڵمانێك کە لە ئیسلام نزیك ئەبێتەوە ، کاتێ تێ گەیشتنی ئەگاتە ئەو رادەیە کە پێویستە لە سەری هەوڵ بدا بۆ ئاینەکەی تا مرۆڤایەتی پێ رزگار بکا ؛ بیر لە سەرکەوتنی ئیسلام ئەکاتەوە .. هەروەکو وا بزانێ ئەمە گیروگرفتێکی تایبەتی ئەوە و بە مێشك و بازووی ئەو نەبێ چارەسەر ناکرێ ..

براکەم ، ئەم بەرنامە رەنگینەی کە ئێمە ئاواتەخوازین لە سایەیا بحەسێینەوە ، بەرنامەی خوایە ، نەخشەی بەروەردگارە ، کەواتە خۆی سەرکەوتن و بە ئامانج گەیشتنی نەخشە ئەکێشێ ، وە خوای گەورە داوای ئەنجام لە ئێمە ناکات و پێویستی نەکردووە لە سەرمان کە هەر ئەبێ لە ژیانا جێ بە جێی بکەین .. بەڵکو ئەو فرمانی داوە ئێمە ئیش بکەین بە پێی ئەو نەخشەیەی کە قورئان و فەرموودە نەخشەیان کێشاوە .. کەواتە ئەرکی سەر شانی ئێمە کاکە هۆشمەند گیان شارەزا بوونە لە ئیسلام تا

بتوانین بەو شێوەیەی کە خوا ئەیەوێ ئیش بکەین و هەوڵ بدەین بۆ ئیسلام •• جا ئەوەش بزانە چەندە شارەزاییمان زیاتر بێت ، ئەوەندەش زیاتر دڵمان پڕ ئەبێت لە سەرکەوتنی بیروباوەڕە خواییەکەمان •• چونکە ئیسلام بەرە بەرە لە سەر ئەمە پەروەردەمان ئەکات تا پشت بە خوا ببەستین و تەنیا بە تەمای ئەو بین ، وە شوێن نەخشە و بەرنامەی ئەو بکەوین •• مل کەچیەکی بێ سنوور بکەین بۆ فەرمانەکانی ، ئیتر خۆمان ناکەینە لێپرسراوو دەست پێشیی نەخشەکانی پەروەردگارمان ناکەین •• ئەمەیە بیمانی دامەزراو •• پێویستە بەندە ملکەچی فەرمان بێت و بە پێی نەخشە فەرمان جێ بە جێ بکا •• ئەوسا بە تەمای پاداشت و رەزامەندی خوا بێت •• وە کە ئیش ئەکا و فەرمان بەردار ئەبێت ، مەبەستی بەندایەتی بێت ، نەك سەرکەوتنی خۆی و بیروباوەڕەکەی ، موسوڵمان کە بانگ ئەکا •• نابێت نیەتی وا بێ ، ئەندام بۆ بیروباوەڕەکەی کۆ ئەکاتەوە و کۆمەڵ پێکەوە ئەنێ تا تۆڵە لە ستەمکاران بکاتەوە •• پێویستە ئەمە بداتە دەست خوا ؟ چونکە ئەگەر بە تەمای ئەوە بوو هەرکاتێ کەس نەهات بە دەمیەوە پشتی

سارد ئەبێتەوە و واز لـە بانگی خوا دێنێت و سەر ئەنجام
مەنزی لە بێ باوەڕی‌یەوە دەر ئەچێ !! •

کاکە گیان ئەمە هەڵەیەکی یەکجار گەورەیـە کـەوا موسوڵمان بەرە بەرە رەزامەندیی خوا لە دڵیا کەم ئەبێتەوە و هەموو ئاواتێکی دێتـە سەر ئەوە چۆن یەکێک بەزێنێت و رایکێشێت بۆ لای خۆی وە موسوڵمانێکی پەروەردەکراو دەست بپرێ و ـ بە ناوی کۆمەکی ئیسلامەوە کەچی لـە راستیا لە قوڵایی دڵیا بۆ رازیی کردنی ئارەزواتی دەروونی بە گـەورە بوونی و شۆرەت پەیدا کردنی ـ بیکاتە پێڕی خۆی ، ئەمە سەری پێ ئەکێشێ بۆ ئەوە ، تەنهـا ئیسلامی نەوەندە بوێ ، تا بە هـەندێ زانیاریی خەڵک بەزێنێ ؟ ئیتر بەرە بەرە قورئان خوێندنی بەلاوە بار ئەبێت و نوێژی بەیانی ئەگەر و نەگەرە •• تا لە ئەنجاما شەیتان وردە وردە لە خشتەی ئەبا و بە گوناهی بچکۆلە و بەرەو گەورەتر ••
سەری لە بێ باوەڕی‌یەوە دەر ئەکا ••

**هۆشمەند :** زۆر لام سەیرە ، کاکە شەماڵ ، خۆ خوا

ستەم لە بەندەکانی ناکات •• چۆن ئەو رووی لە خوا بێت گومڕا ئەبێت ؟!! ••

**پشتیوان** : (بە زەردەخەنەوە سەیرێکی شەمال ئەکا وەکو داوای ماوەی لێ بکا) زۆر راستە کاکە هۆشمەند گیان ••خوا زۆر دادپەروەرە ، بەڵام ئەمە ئەنجامی بەندەیەکە بە پێی نەخشەی خوا بە کاری ئیسلامی هەڵنەسێ •• بۆیە هەندێ ناوچەمان هەروا دواکەوتووە و ئەگەر تاك و تەرایەکیش لە بانگی خوا نزیك بوو بنەوە پشتیان لێ هەڵکردووە !

**هۆشمەند** : جا بە وازهێنانی ئەوانە بانگکەران ناوابار نابن ؟•

**پشتیوان** : ئەمەیە ئەو نەگبەتی‌یەی کە روو ئەکاتە موسوڵمان ئەگەر لە نەخشە تێ نەگا و بە شێوەیەکی ئیمانی‌ی ئیش بۆ ئیسلام نەکا •• وە یان ژێربەژێریی خەریکی گوناه و تاوان بێت و لە رواڵەتیشا خەڵکی بە موسوڵمانی بزانن ••

براکەم ئەم ئاینە خاوەنی هەیە ، ئەوەی ئارەزوو بازیی

تیا بکا رسوای ئەکا ‎٠٠‎ ئەوەی لە نەخشەی ئیمان بەو لاوە خەریکی شتێکی تر بێت، بت پەرستی‌یە با لە بەر خۆیشیەوە یەوێت شوێن کەوتووانی ئیسلام پەرە پێ بسێنێ ‎٠٠‎

**هۆشمەند** : بەلام هەموو کەسێ ناتوانێ زانیاریی تەواوی هەبێ تا لە ووردەکاریی نەخشەکە بگا !!

**پشتیوان** : باش بوو ئەمەت دەرخست ‎٠٠‎ خۆیشم ئەترسام وا تێ بگەیت ، براگیان مەبەست ئەوە نی‌یە هەموو کەسێ بە تەواوەتیی لە ئیسلام و ئەحکامەکانی شارەزا بێت ئەوسا ئامۆژگاری‌یەکی بچکۆلەی هاوڕێ‌یەکی بکات ‎٠٠‎ بەڵکو مەبەست ئەوەیە : با بزانێ جارێ خۆی بەندەی خوایە ، وە هەرچی ئەکا ئەیەوێ خوا لە خۆی رازیی بکا، وە هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی دەروونی خۆی بێت ‎٠٠‎ خەمی کەسانی تر نەخوا و خۆی لە بیر بچێتەوە ‎٠٠‎ بەمە دەست ئەداتە خواپەرستیەکی رێك و پێك لەم کاتەدا کە ئەم سەرگەرمی خواپەرستی‌یە ئەوەی بە کەڵکی شوێن کەوتنی ئیسلام بێت ، خوا بۆی ئەنێرێت ‎٠٠‎ بەلام ئەگەر وازی لە خۆی و دەروونی هێنا و کەوتە پەلەقاژە بۆ

کۆ کردنەوەی شوێنکەوتوو ؟ خواش هەر بە گوێرەی ئەم لێ بڕانەی ، ئەندامی بۆ ئەنێرێ ، کەوا بە چەپا ئەڕوا و بە راستدا بە خاڵی ئەگەڕێتەوە •• ماوەیەك چەند دەم و چاوێکی گرژ و مۆنی لێ کۆئەبنەوە و هەر ئەوەندە نەزانێ هەموویان وازی لێ دێنن ، ئەگەر نەبنە دوژمنی ••

**هۆشمەند :** خوا پاداشتتان بداتەوە برا گیان ••

**شەماڵ :** ئەگەر هەر بتەوێ لە چۆینەتیی سەرکەوتنی ئایینی خوا بگەیت ، پێویستە سەرنجی قورئان و فەرموودە بدەیت ؟ نەك سەرنجی هێز و وزەی کافرانی ئەمڕۆ چونکە سەرنجدانت لە قورئان و فەرموودە پێت ئەسەلمێنێ هێزی موسوڵمان هیچ کات لە راستیدا هاوتای هێزی کافر نەبووە •• کەچی چونکە لەگەڵ نەخشەکە دەست لە ملی یەك بوون ، سەرکەوتووە •

سەیر کە نوح پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ نۆ صەد و پەنجا ساڵ بانگ ئەکا بۆ لای خوا بێ ئەوەی بزانێ چۆن سەرئەکەوێ ، توانای خۆی تەواو ئەکا و لە خوا ئەپاڕێتەوە تا یارمەتیی بدا •• خواش کلیلی سەرکەوتنی

پیشان ئەدا ـ کە ئەویش دروستکردنی کەشتیەکە بوو ـ تا خۆی هێزی خۆی بخاتە کار بۆی ..

وە سەیر کـە یوسف پێغـەمبەر ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ کە بە ناڕەوا ئەکرێتە خزمەتکاری مالآن ، وە لەوێش بە ناڕەوا ئەخرێتە بەندیخانەوە بە ناوی تاوانێکەوە کە لەو وڵاتەدا هیچ کەس وەك ئـەو لێی دوور نەبووە . ئـەبێ موسوڵمانی ئاوارەی بـەندی مالآن و بەندی چوار دیواری بەندیخانە چۆن بە تەما بێ هەوڵ بدا بۆ ئاینەکەی ؟! .. ئەبێ چۆن حسابی سـەرکەوتنی خۆی بکا ؟! لە کاتێکا ئەم ستەمەگەورانەی لێ کراوە !!

موسوڵمانی ستەم لێ کراو چونکە لـە ئیمان و ئیسلام تێ گەیشتووە بـە سنگێکی فراوانـەوە و مل کـەچیـەکی تەواوەوە ؛ ویستی خوا وەرگرێ .. لە بەندیخانەشدا هەر بانگ ئەکا بۆ سەر ڕێبازە راستەکەی خوای تاك و تەنیا و بە دەسەڵات .. تا خوا سـەری ئەخات و میسر بە فەرمانی خوا رزگار ئەکات ! ..

ئازیزەکـەم .. نمونـەی سەرکەوتنی پێغەمبەرەکان ـ

سـەلامی خـوایان لێ بێت ـ و پیـاو چاکـەکانـی دوای پێغەمبەری خۆشـەویستمان ـ صلی الله علیه و سلم ـ بە سەرە پێی هەڵنادرێ ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زۆر هەیە وا بزانم ئەمەی پێشەوە بۆ نمونە بەسە •

**هۆشمەند** : بەڵام کاکە گیـان لێدانی موسولمانەکانی ئەمڕۆ لە هەموو کون و قوژبنێکی ئـەم جیهانەدا بەو شێوە دڕندانـە دڵی پیـاو ئەخاتـە مـەترسی یـەوە •• جـا ئابـا موسوڵمانەکان بـەرگـەی ئـەم هـەموو ئازار و نـەخشە گلاوانە ئەگرن ؟!!

**شەماڵ** : زۆر راستە ئازیزەکەم ، ئەمڕۆ نەفامی بە هەموو هێزێکیەوە دژی بانگی خوا ئـەوەستێت و بـە هیچ شێوەیـەك دەسـت پارێز لـە موسوڵمانەکان ناکات •• وە موسوڵمانەکانیش ئەمڕۆ نەگەیشتونەتە ئـەو رادەیەی کـە بتوانن راستەوخۆ دەستی لێ بکەنەوە •

بەڵام ئـەوە بۆچ موسوڵمانە کـەم هێزەکانی مەککـە ناهێنیتە بەر چاوت ؟! کێ بـە تـەمای سەرکەوتنیان بوو ؟! وە لەشکرە دەروون رەشە دە دوانزە هەزارەکەی ئەحزاب

که له بەردەم خەندەقەکەی مەدینەدا مەلاسی دا بوو و ئەم سات و ئەو ساتی بوو تا هێرش بەرێتــە ســەر لەشــکری رووت و برسیی موســوڵمانەکان کــە بــە دەست ســەرمای زستان و برسێتیی ساڵی وشکەوە گیریان خوارد بوو •• بە ترازووی زەویی کێ بە تەمای سەرکەوتنی ئیسلام بوو ؟! کێ بە تەما بوو تاقە موسوڵمانێك دەرچێت ؟!

ئەمڕۆ نەخشەیەکی گلاوی زۆر گــەورە لــە لایــەن کافرانەوە کێشراوە ؟ تا نەهێڵن بانگی ئیسلامیی بچێتە دڵ و دەروونی مرۆڤە سەرگەردانەکانەوە •• بەڵام بۆ ؟! هــەر تەنها لە بەر بەرژەوەندیی ستەمکاران و خوێن مژان •• دەی ئەوەش چاك بزانــە خوای بە دەسەڵات هــەر ئــەبێ ئــەو نەخشەیە تێك بدا ، چونکە خوا دژی ستەم و ناڕەوایە • وە ئەوانــەش پشت گیریی ستەم ئەکــەن نــەفامن و خۆیان ماندوو ئەکــەن و دووربینیی ناکەن •• وە لــە کارەساتی رۆژگاری دوور و درێژ پەند وەرناگرن ••

**هۆشمەند** : واتە تۆ دڵت لە سەر ئەوە دامەزراوە هەر ئەبێ کۆمــەڵی موسوڵمان پشتی نەفامیی بدا بــە زەویدا و

نێردوی قورئان بخاته کۆڕی ژیانەوە ، وا نی‌یە کاکە شەماڵ ؟

**پشتیوان :** ( بە ڕێزێکەوە سەیری شەمالی کرد ) ئێمە نابێت هەر بە تەمای ئەمە بین و بەس ‎•‎• چونکە ئەگەر ئەمە بکەینە تاکە مەبەستمان ؟ لەوانەیە خواپەرستی‌یمان لە بیر بچێتەوە ‎•‎• لەوانەیە بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە لە بەر پەلە و هەلە ، پەنا بەرینە بەر هەنگاوی لار و وێر و لە راستێتی‌ی ئیسلام دوورمان خاتەوە ‎•‎• چونکە راستە ، ئێمە بڕوامان لە سەر ئەمەیە تا مرۆڤایەتی‌ی نەیەتەوە ژێر سایەی حوکمی قورئان بە هیچ شێوەیەك ناحەسێتەوە ‎•‎• وە پێویستە ئەم راستی‌یەمان لە بیر نەچێت ، بەڵام ئەمە هەوڵ و کۆششی راستەقینەی ئێمە نی‌یە ، بەڵکو ئەمە بەرهەمێکی رەنجی موسوڵمانانە ‎•‎• کە بە هەموویانەوە خەریکی مل کەچی و بەندایەتی و فەرمانبەرداریی خوای گەورەن ‎•‎• چونکە هەر کۆمەڵێ بە پێی ئیسلام خواناسی و بەندایەتیی خۆی بە جێ هێنا ، خواش دەسەڵات و کار و باری سەر زەویی ئەداتە دەست ، بەڵام کەی ؟ کاتێ شیاو بێت و لە تاقی کردنەوەدا دەرچێت ‎•‎•

ئینجا مەرج نی‌یە سەرەنجامی هەموو کۆمەڵێکی موسوڵمان وەکو یەك بێت •• سەیری سەرەنجامی بانگی نوح پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێ بێ ـ بکەن ئەو هەمووە ماندوو بوون و زەحمەتەی ، کە لە قورئانا باس کراوە ، هاتۆتە رێ ، کەچی دوای سەرکەوتن هیچ جۆرە باسێکی ژیانی سایەی ئایینی خوا دەر ناکەوێت •• یا سەیری رۆژی نەوتانی فیرعەون بکەن ، چۆن خوای گەورە ئەو هەمووە بەخششانە ئەرێژێت بە سەر بەنی ئیسرائیلدا ، کەچی سەرنجی قورئان بدەن بزانن دوای ئەوە چ ئازارێکی موسای پێغەمبەریان دا ؟!!

یا سەیری هەوڵ و کۆششی کۆمەڵی «أصحاب الأخدود» بکەن چۆن بە دەستی کافر تاقیان بڕاوە •

یا سەیری کۆمەڵی «أصحاب الكهف» بکەن چۆن دوای بە جێ هێشتنی نیشتمان و کەس و کار لە پێناوی بیروباوەڕدا ، دانیشتوان کەوتنە شوێن رێبازەکەیان و دوای بە خەبەر بوونەوەیان کە پێیان زانین چۆن رێزیان لێ گرتن ••

ئینجا سەیری ئەنجامی بانگی پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلی الله علیه و سلم ـ بکەن چۆن بە ماوەیەکی کەم لە ژیانی کۆمەڵێکی بەڕێزدا کرا بە پرۆگرام و لە سایەیا حەسانەوە ..

**هۆشمەند** : بەڵام کۆمەڵی « أصحاب الأخدود » وا دەر ئەکەوێ سەرکەوتنیان بە دەست نەهێناوە ..

**شەماڵ** : (ماوە لە پشتیوان وەر ئەگرێت) ئەمە ئەو دووڕیانەی کە وا ئەزانین یەك ڕێگایە و سەرمان لێ تێك ئەدا .. چونکە ڕاستە بە بیری ئەوانەی کە حەز ئەکەن بە ناوی ئیسلامەوە خەڵك لە دەوری خۆیان جەم کەن،وا ئەزانن سەرکەوتن بریتی‌یە لە تێك شکانی هێزی نەفامی‌ی .. وە لەم شێوە بەولاوە هیچ سەرکەوتنێك بۆ هیچ کۆمەڵێك لە قەڵەم نادەن .. ئەمە تەنها شێوەیەکی سەرکەوتنە ..

بەڵام کۆمەڵی « أصحاب الاخدود » کە بەو شێوەیە ستەمکاران چاڵی ئاگریان بۆ ساز ئەکەن و خۆیشیان بە دەوریا کۆڕ ئەبەستن بۆ ئاهەنگ و خۆشی و لەزەت بردن لە قرچەی گۆشت و ئێسقانی موسوڵمانە دڵ بەستراوەکان

به خواوه ‧‧ وه بۆ ئەوەی دەست بێنن بە سەر دڵیانا کـە کۆمەڵی چاکویست بەو شێوە دڕندانەیە گۆشت و ئێسقانی بسووتێ و ببێ بە خۆڵەمێش ‧‧ ئەم کۆمەڵـە موسوڵمانە قورئانی پیرۆز دوو سەرکەوتنیان بۆ تۆمار ئەکا ، یەکێکیان لەم ژیانەدا کەوا بـەو شێوەیە ئازار ئەڕێژێت بـە سەریانا کـەچی مل نادەن بـە کافرێ ڕەش[1] ؛ دووەمیشیان لـە ڕۆژی قیـامەتدا کـە لـەوێ بـەشی دووەمی زۆرانبازیەکە تەواو ئەبێت ‧‧

**هۆشمەند** : تەنها ئەوە داخە ئەم بەڕێزانە نەیانتوانیوە بەرنامەکەیان لە ژیانی ئادەمیزاددا ئیش پێ بکەن ‧‧

**شەماڵ** : باشە کاکە هۆشمەند گیان‧‧ پرسیارێك‧‧ بە بیری تۆ کە سومەیە یەکـەم شەهیدی ئیسلامـە و لـە مەککەدا لە کاتی بێ دەسەڵاتی ئیسلامدا شـەهید کراوە ، ئیتر سەر نەکەوتووە ؟!

**هۆشمەند** : بەڵێ ‧‧ سومەییە باوەکو خۆی شـەهید کرا بەڵام بیر و باوەڕەکەی لە ئەنجاما سەرکەوت ‧‧

---

(١) واتە سەرکەوتنی ئیمان بە سەر ژیاندا ‧

**شەماڵ :** دە ئەمە پێویستی بە روون کردنەوە هەیە ٠ کاکە گیان ئەگەر ئیسلامیش لەو سەردەمەدا سەر نەکەوتایە سومەیە هەر سەرکەوتنێکی بە دەست هێنا بوو ٠

**هۆشمەند :** سەرم سوڕ ئەمێنێ !!

**شەماڵ :** هیچ سەرت سوڕ نەمێنێ ؛ ئازیزەکەم ٠٠ هەتا موسوڵمانێ بە سەر زەوی‌یەوە بمێنێ ، سومەیەی شەهید هەر بەرەو سەرکەوتن ئەڕوا ٠٠ چونکە تا کۆتایی ژیان ؛ ئەو خەریکی وتنەوەی وانەی شەهیدی‌یە ، تا هەزارەها بەڵکو ملیۆنەهای وەك ئێمە سامان بشکێ و بوێرین خۆمان بخەینە مەترسی‌یەوە ٠٠ هەروەك کۆمەڵی «أصحاب الأخدود» یش هەتا جیهان ماوە مامۆستایەتی مرۆڤایەتی ئەکەن ؛ تا وانەی جۆرێکی تایبەتی و پڕ لە هێز و پاڵەوانێتی و سەرکەوتنی پێشکەش بکەن ٠٠

**هۆشمەند :** زۆر سوپاستان ئەکەم کاکە گیان ٠٠ بەڵام ئەم ئازار و لێدان و نەخشە گڵاوانەی کافر ، ئەبێ سەرەنجامی چۆن بێ ، بۆ بانگی ئیسلامی‌ی ؟

**شەماڵ :** گرنگ لەم باسەدا ئەمەیە تەنها هەتا لێدان و سزادانی موسوڵمانەکان زیاد کات ، ئینجا گەنجی خوێن

گەرم باوەش ئەکا بە ئیسلاما •• بەڵێ کافر هەموو رۆژێك و هەموو ساڵێك نەخشەی گڵاوتر ئەکێشێ ، بەڵام هەرگیز ناتوانێ بیروباوەڕی ئیسلامی ریشەکەن بکات •• چونکە چەندە ئازار و ستەم زیاد بکات ، خوایش زیاتر کۆمەك و بنیوان لە ئاینەکەی کۆ ئەکاتەوە ، ئەمانەش هەتا تەنگ و چەڵەمەی زیاتر بێتە رێگەیان زیاتر ئیمانیان دائەمەزرێ و زیاتر لێ ئەبڕێن و لە سەر کۆڵنەدان سوور ئەبن •• ئینجا هەتا سەرکەوتنیش دواکەوێت نەفامیی زیاتر ئەگەنێ و گەلان زیاتر چاو ئەکەنەوە •• کورتەکەی بناغەی ئیسلام پتەو تر و فراوان تر ئەبێت ••

ئینجا ئەمڕۆ کە ئەبینین کافری خوانەناس بەندەی ئەڵقە لە گوێی لە جیهانی ئیسلامی‌یا داتاشیوە و بە ناوی گەل و وڵاتەوە ئەیانەوێ دەست بخەنە قوڕگی موسوڵمانەکانەوە ، ئەمە بەڵگەیە کەوا ، یەکەم : کافران ترس و لەرزیان لێ نیشتووە و دواڕۆژ بە موڵکی بیروباوەڕی ئیسلامی ئەژمێرن • دووەم : پێڕی نۆکەرانی بێگانەش لە کورسی‌یەکانیان ئەترسن ، چاوەڕوانی ئەمڕۆ و سبەینێ ئەکەن تا لە سەریان فڕێ بدرێنە خوارەوە ••

**هۆشمەند :** ئێستا لە قووڵایی دڵما جێی بۆتەوە کەوا چاریان نەماوە جگە لە بە کار هێنانی زۆر و ستەم •

**شەماڵ :** ئافەرین کاکە هۆشمەند گیان •• بێگانەی کافر بە یارمەتی نۆکەرەکانی ؛ هەموو ڕێگایەکیان بـە کار هێنا بۆ شۆینـەوەی مێشکی موسوڵمانەکان لـە بیروباوەڕی ئیسـلام ، جا هـەر چـەندە تا ڕادەیـەکی زۆر لـەمـەدا سەرکەوتن ، ئەویش بە بە کار هێنانی قوتابخانەی تەبشیری و گۆڤار و پـەڕاو و ڕۆژنامـە و ڕادیۆ و تـەلەفزیۆن و سینەما و شانۆ و ••• هتد ، بۆ ڕاکێشانی گەنجی موسوڵمان بۆ ناو زەلـکاو و زۆنگاوی بەرەڵلایـی و بێ ڕەوشتیی ؛ بەڵام سوپاس بۆ خوا •• وا ئـەو نـەخشانـە هـەموویان پوچەڵ ئەبنەوە لە بـەر دەم تینی عەقیدەی ئیسلامدا ؛ وە ئەوەتا بۆ سەر زەویی دەرکەوت ، یاسا دانراوەکان پڕن لە کەم و کوڕی و بە هیچ شێوەیەك ئاسایش نایـەخشن بـە دەرۆڤایەتیی •• 

ئەوە بۆ سەیری گـەنجی موسوڵمانی شارەگەورەکان ناکەی ؟! ئەو شارانەی کە پڕ کراون لە هەموو جۆرە بێ ڕەوشتیـیـەك ، چۆن هـەر بێزیشی نایـەت ئـاوڕی بـۆ

بداتەوە ؟!! سەیری ناکەی چۆن کاتی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی قورئان ؟! ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ هەستی بە دەردەکانی مرۆڤایەتی‌ی کردووە و لە لای سەلماوە مرۆڤایەتی‌ی داماوی دووری‌ی ئەم ڕێبازە خوایی‌یەیە لە کۆڕی ژیاندا ، بۆیە ، هەموو تاڵی و سوێرییەك قبوڵ ئەکا لە پێناویا ..

**هۆشمەند :** بەڵام ئەگەر ئیسلام سەربەست بوایە خەڵکی‌ی زیاتر ئەهات بە دەمیەوە ؟ مرۆڤایەتی‌ی زووتر ئەگەیشتە ئاوات ..

**پشتیوان :** کاکە شەماڵ گیان داوای ماوەت لێ ئەکەم (ڕوو ئەکاتە هۆشمەند) کاکە گیان .. هەر بیروباوەڕێك بەئاسانی دەستکەوێ بە ئاسانییش وازی لێ دێنرێت ، و پشتی لێ هەڵئەکرێ ..

ئینجا ئەوەش بزانە یاسای خوایە و وا بڕیاری داوە ، هیچ کۆمەڵێکی موسوڵمان بێ تاقی‌کردنەوە نەبووە ، بۆ ئەوەی بەرگە نەگران وازی لێ بێنن و ئەوانەش خۆیان و بەرژەوەندی‌یەکانیان ئەخەنە پشت گوێ لە سەری بمێننەوە و کۆڵ نەدەن.. بۆ ئەوەی بێ هێز و بەرژەوەندیی

پەرستەکان کە بەرگە نەگر و لێ نەهاتوو و ترسنۆکن لە جادەی پانا فیز نەکەن ، بکشێنە دواوە ..

**شەماڵ :** ئینجا ئازیزەکەم ، لەم چەرخەدا بیری لار و وێری بێگانەو نۆکەرەکانیان ، بە ناوی زانیاری‌یەوە ، بڵاوی ئەکەنەوە ، کەوا ڕۆژ بە ڕۆژ ئایین لە تەواو بونایە و بەرە بەرە خەڵکی‌ی وازی لێ دێنن .. جا ئەمە تەنها چاو بەستە بۆ ئەو کەسانەی کە بیروباوەڕی ئیسلامی‌ی لە دڵ و دەرونیانا ریشکی دانەکوتاوە ، تا پشتی لێ سارد بکەنەوە و دەستی لێ بشۆن .. جا ئەگەر ڕاستەکەن با واز لە ئیسلام و شوێنکەوتووەکانی بێنن ، ئەم ماوەیەی کە ماویانە تەواوی کەن ؛ خۆیان بەرە بەرە تەواو ئەبن و تیا ئەچن .. چونکە هەر بیروباوەڕێ بێ کەڵک بێ ، هەر چەند کۆمەڵی زۆر بێ هەر ئەبێ تیا چێ ، وە ئەوەیش بێ شتیوان بێ بە مەرجێ بە کەڵک بێت ، هەر ئەبێ پەرە بسێنێ ..

جا بە کار هێنانی هێز دژی بانگی ئیسلامی‌ی ئەوە ئەگەیەنێ ئیسلام لە گەشە کردنایە ، بە جۆرێکی وا کافران

سکار هاتۆتە ژان و خۆیان پێ ناگیرێ لێی بێ دەنگ بن•

**هۆشمەند** : زۆر راستە ، بەڵام وا دیارە ئەمانە بەم ئازار و ستەمەیان یارمەتی کۆمەڵی موسوڵمان ئەدەن ، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن •• چونکە ئەگەر لێیان شەهید ئەکەن ئەوە ئاواتی هەرە بەرزیانە ؟ وە ئەگەر لێیان پەشیمان ئەکەنەوە خانە و سێڵێ نەخۆش و لاواز لە لاشەی بانگەکەیان دوور ئەخرێتەوە تا زیاتر پتەو بێت و باشتر بەرگە بگرێت ••

**شەماڵ** : ئافەرین کاکە هۆشمەند گیان •• هەزار جار ئافەرین •• بیرو باوەڕی لاواز و نەخۆش کە تەنگی پێ هەڵچنرا •• نازانێ چی بکا باش بێ ، هەتا دێت هەنگاوی هەڵەشە و شێتانە ئەنێت ؟ تا سەرەنجام ناچار ئەبێت جەنگی خوێناویی راستەوخۆ بەرپا بکا و لە ئەنجامیشا بە سەرشۆڕیی سەر بنێتەوە ••

**پشتیوان** : بەڵێ هێزی نەفامی هەموو ساتێکی هەر نەفامییە ، کاتێ دەستی ئەڕوا بە فیز و دەمارەوە ستەمی لە سنوور دەر ئەچێ ، کاتێکیش لە تیاچوونی ترسا ئاواتی

تۆفان ئەخوازێ بۆ دوای خۆی !! بەڵام هێزی ئیسلامیی هەموو ساتێکی هەر دانایەتیی و ژیرانەیە •• کاتێ بێ دەسەڵاتە بەوپەڕی تواناوە دان ئەگرێ بە خۆیا و بەرگەی کارەسات ئەگرێ ، کاتێکیش دەستی ئەڕوا لێ بوردن و چاوپۆشیی و نەرم و نیانی و خزمەت کردنی مرۆڤایەتیی پیشەیەتی •• چونکە مەبەستی رزگار کردنە ، شایەتیشمان مێژووی دوور و درێژی مرۆڤایەتیی یە ••

**هۆشمەند** : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە دەستی منی گرت و خستمیە سەر ئەم رێگە راستە و وا ئێوەشی کرد بە چاو ساغم ، تا لە سەری دامەزرێم و لا نەدەم ، وە داوا کارم لێی پاداشتی ئێوە و هەموو موسوڵمانێکی دڵسۆز و خەمخۆری ئاینەکەی بە چاکە بداتەوە ، جا منیش پێویستە لە خۆم بپرسم و بڵێم :

**« تاکەی دوورە پەرێز بم ؟!! »**

جا لەمەو لا بڕیار بێت ، ئەگەر خوا ویستی لە سەر بوو ، باوەش کەم بە قورئاناو بەپێی توانای خۆم لەزانیاری و

دانایەتیەکەی مێشك و دڵ و دەروونم تێر بکەم •• وە دوای ئەم تێ گەیشتنەم هەوڵیش بدەم لەگەڵ قوتابی‌یە هاوڵەکانما تا شوێنی ئیسلام کەون ؛ ئیتر تا کەی ئێمە ، کە پێمان ئەڵێن رۆشنبیر •• گوێ لە مشتی بێگانەی کافر بین ؟!

جا ئازیزەکانم وا بزانم گەرمی‌ی باسەکە کاتی لە بیر بردومەتەوە و ئەبوایە رووتر بڕوێشتمایە ، بۆیە داوای رەوەتان لێ ئەکەم تا من بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە •

**شەماڵ :** زۆر چاکە بەدەم پێش جیا بوونەوەمان با سوتەتێکی ئیسلامیش بە جێ بێنین کە هەر یەکەمان سوورەتی (العصر) بخوێنین ، تا لە یادمان بێت چ ئەرکێکی گەورە وا لە ئەستۆمانا وە چ چارەنووسێکی پڕ مەترسیش چاوەڕێمان ئەکات ••

**پشتیوان :** خوا پاداشت بداتەوە کاکە شەماڵ گیان •

[ **هەر سێکیان سوورەتەکە ئەخوێنن** ] •

**شەماڵ :** سبحان ربك رب العزة عما يصفون و سلام على المرسلين •• و الحمد لله رب العالمين ••

**هۆشمەند :** السلام عليكم ••

**هەردوكيان :** و عليك السلام و رحمة الله و بركاته • و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

ذى القعدة/١٤٠٠ هـ
أيلول/١٩٨٠ م

# ئەم نامیلکەیە

دەری ئەخات کە :

- هەوڵ و کۆششی موسڵمان لەم ژیانەدا بۆ رەزامەندیی خوای پەروەردگارە ..
- سەرەنجامی هەموو زۆرانبازییەکی نێوان موسڵمان و کافر ، بە قازانجی ئیسلام و موسڵمانەکان تەواو ئەبێ، بە مەرجێ موسڵمانەکان بە رێك و پێکیی لە قورئان بگەن و بە راستیی دەستی پێوە بگرن ..

نرخی ( ٣٥٠ ) فلسە